# پێشکەش

**پێش کەش بێت:**

بەو موسڵمانە بەڕێزانەی کە لە سەر ڕێبازی قورئان و سوننەت بناغەی ئیمان دائەرێژن تا ئایینەکەیان بگەیەنن بە مرۆڤایەتیی و لە سەرگەردانیی قیامەت رزگاریان بێت.

بەو مرۆڤە وردانەی کە بە راستیی بە شوێن ڕێبازی بەختەوەریی ئادەمیزاددا ئەگەڕێن تا دەستیان کەوێ و بە پاکیی شوێنی کەون و لە سزای دۆزەخ رزگار بن..

# پێشەکیی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ربّ أوزعني أن أشكر نعمتك التي أنعمتَ عَلي وعلى والدي وأن أعمل صالحاً ترضيه وأدخلني برحمتك في عبادك الصالحين ﴾ (النمل: ١٩)
﴿ ربنا لا تؤاخذنا إن نسينا أو أخطأنا .. ﴾ (البقرة: ٢٨٦)
﴿ رب اشرح لي صدري ويسر لي أمري .. ﴾ (طه: ٢٥ - ٢٦)

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

پێم خۆشە ـ بە پشتیوانیی و کۆمەکیی خوا ـ لە خزمەت خواناسێکی هەڵکەوتوودا چەند ساتێک ژیان ببەینە سەر..

خواناسێک سەراسەری ژیانی بۆ خواناسیی، زانیاریی، کارکردن، چاکەخوازیی، پەروەردەی دڵ، هەوڵ و کۆشش بۆ قیامەت، تەرخان کردبێ..

خواناسێک لە بەر دڵسۆزیی و راستگۆیی بۆ رێگای خوا ئاوڕی بە لای ژیانی تایبەتیی خۆیدا نەدابێتەوە.

خواناسێک خۆشەویستیی و خەم خواردنی موسڵمانان و گرۆی ئادەمیی لە قووڵایی دڵیا جێ کردبێتەوە.

خواناسێک ئەوەندە خاوەنی سنگی فراوان و سۆز و بەزەیی و چاوپۆشیی بێت، تاقە جارێک نزای شەڕ و خراپە لەوانە نەکات کە نەیان هێشت بە درێژایی تەمەنی پشوویەک بدات، بێ ئەوەی دژیان بووەستێ و پاشقولیان لێ بدات.

خواناسێک هەموو ژیانی تەرخان کردبێ بۆ بەهێزکردنی ئیمان و گەشەکردنی، تا بە جوانیی لە نووری قورئان تێ بگات و کۆمەڵێکی قیامەتویست پەروەردە بکات..

بەڵێ، مرۆڤایەتیی زۆر پێویستی بە ڕێنمایی ئەم جۆرە پیاوانە هەیە تـ ڕێگای ڕاستەقینەی پیشان بدەن و لە ڕاستێتیی بانگی خوا شارەزای بکەن. نەکا بە هەڵە و ناتەواو لێی تێ بگا و ببێتە مایەی زیان بۆی.

چونکە هەموو چەرخێک پێویستی بە تێگەیشتنی تایبەتیی خۆی هەیە لە ئیسلام، بۆیە پیاوە گەورەکانی ئیسلام کاریان تێگەیشتنێکی تازەی ئیسلامە کە لەگەڵ چەرخەکەیاندا بگونجێ. ئەو پیاوە گەورانە دەرد و ناتەواویی ئەو سەردەمە ئەزانن و بەو پێیە دەرمان بۆ موسڵمانەکان ئەنوێنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێنی بە موسڵمانان داوە کە خوای گەورە بۆ هەموو چەرخ و سەردەمێک کسانێ ئەنێرێ کاروباری ئایینەکەی تازە بکەنەوە، کاروباری شێوەی بانگکردن و پێویستیی موسڵمانان، نەک تازەکردنەوەی ئیسلام، چونکە ئیسلام ئایینی خوایە و کۆن نابێت. ئەفەرموێ:

« **إن الله يبعث لهذه الامة على رأس كلّ مائة سنة مَن يجدد لها أمر دينها** ». رواه ابو داود والحاكم وصححه، والبيهقي.

شانازیی پێوە ئەکەم بۆ دەرخستنی کەمێ لە ژیانی پڕ لە فەڕ و بەرەکەتی مامۆستا نوورسیی خامە بخەمە سەر کاغەز، بەڵام بەوپەڕی شەرمەزارییەوە چونکە نەک هەر من بەڵکو تا ئێستا هیچ نووسەرێک نەیتوانیوە بە تەواویی ژیانی ڕوون بکاتەوە و مافی تەواوی خۆی بداتێ.. چونکە بەڕاستیی ئەوەی بە وردیی سەرنج بدات تێ ئەگات کە مامۆستا نوورسی کاروباری ئایینی ئیسلامی، بۆ سەردەمی خۆی، بە وتە و بە کردەوە و بە پەیامەکانی کە لە سەرانسەری جیهاندا بلاوەیان کردووە و لە نووری قورئانی پیرۆز هەڵی گۆزیون، تازە کردۆتەوە.

نووسەر
سلێمانیی
١٧ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٩ ک
٢٨ی تەشرینی یەکەمی ١٩٨٨ ز

# لەدایکبوون و پێگەیشتنی

[ ١ ] لە دایکبوونی:

جیهانی ئیسلامیی لە هەلوێستێکی پڕ مەترسییدا بوو: لە لایەکەوە رۆڵەکانی دواکەوتوو و لە لایەکیشەوە گورگە هارەکان دەوریان دابوو، مرۆڤە دڵسۆزەکانیش چاویان بڕی بووە ئاسمان و هاواریان لە پەروەردگار ئەکرد رابەرێکی دەست و دەم پاکیان بۆ پەروەردە بکات و بە بیری تیژ و هەستی پاکی جیهانی ئیسلامیی لە لافاوی بێباوەڕیی و خوانەناسیی و داو و تەڵەکەی دوژمنان رزگار کات.

ئەوە بوو لە دامێنی کێوە گەردن کەشەکانی کوردستانی[1] تورکیادا، کە هەمیشە بە بەفر داپۆشراون و لووتیان لە ئاسمانی شین گیر کردووە، لەگەڵ بەرەبەیاندا، لە ناو بنەماڵەیەکی کوردزبانی خواناسدا، کۆرپەیەک هاتە دنیا.

لە گوندی «نوورس» کە دێهاتێکی بەخشداریی «ئیسپاریت»ی سەر بە قەزای «هیزان»ی سەر بە پارێزگای «بەدلیس»ە لە ساڵی (١٢٩٠)ک- (١٨٧٣)ز دا مامۆستا «سەعیدی نوورسیی» هاتە دنیا، واتە سێ ساڵ پێش خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم.

خوای گەورە بەخششی زۆری پێ بەخشی بوو کە یەکێ لەوانە لە دایک و باوکێکی زۆر خواناس بوو. باوکی، کە ناوی «میرزا» بوو و لە بەر خواناسیی ناو نرا بوو صوفیی میرزا، بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی ماڵ و منالی بەخێو ئەکرد، نموونەیەکی بەرز بوو لە خواناسییدا، بە رادەیەک تامی حەرامی نەکردبوو، وە جگە لە حەلاڵ هیچی دەرخواردی منالەکانی نەداوە، خاتوو «نوورییە»ی دایکیشی نموونەی دایکی ئیماندار و رۆڵەپەروەردەکەر بوو. لە بنەڕەتا خێزانەکەیان لە ویلایەتی ئیسپارتەوە هاتووە، نەسەبیشی ئەگەڕێتەوە سەر ئالوبەیت، لە سەری باوکیەوە ئەگاتەوە بە سەردارمان «امام حسەن» و لە دایکیشیەوە بە سەردارمان «امام حوسەین» خوا لێیان ڕازی بێت.

(١) بە درێژایی سەردەمی عوثمانییەکان ناوچەی کوردەواریی کە لە خۆرهەلاتی تورکیادا بوو بە «کوردستان» ناو ئەبرا، دوایی لە سەردەمی کۆمارییدا ناوەکەی گۆڕرا بۆ «ویلایەتەکانی خۆرهەلات»!

کۆرپەی بەختەوەر بەرە بەرە گەورە ئەبوو و سەرنجی دەورویەری ئەدا.. ڕەوشتی جوان و ڕێک‌وپێک لە خێزانی خواناسەوە فێر ئەبوو، وەک ڕەوشتی هەموو منداڵێک زۆر حەزی لە پرسیارکردن بوو بۆ شارەزابوونی هەر شتێ کە بە جوانیی لێی تێ نەگا، دایک و باوکیشی بە ئارامێکی زۆرەوە وەڵامی پرسیارەکانیان ئەدایەوە.

هەر بە منداڵیی پێی خۆش بوو لەگەڵ پیاواندا دانیشێ و گوێ لە وت و وێژیان بگرێ[(٢)]، بە تایبەتیی کۆڕی خوێندەوارانی گوندەکەی کە لە شەوە دوور و درێژەکانی زستان‌دا لە ماڵی باوکیا کۆ ئەبوونەوە، هەر بەو منالیّیە هەموو جارێ پرسیارێکی خنجیلانە بە بیریا ئەهات، کە دوایی خۆی ئەی‌گێڕایەوە و ئەی‌وت:

[جارێکیان لە کاتی منداڵییمدا، لە ئەندێشەی خۆمم پرسی:

« کام لەم دوانەت بە لاوە باشترە: تەمەنێکی پڕ بەختەوەرییت لەگەڵ دەستەڵاتداریی و خۆشیی دنیادا بێ بەڵام بە نەمان و نەبوون (العدم) کۆتایی پێ بێت.. یان بەهەمیشەیی بمێنیتەوە لەگەڵ ژیانێکی ئاسایی سەختدا ؟ ».

سەیرم کرد حەز لە دووهەم دەکات و بێزاریی لە یەکەم دەر دەبڕێ و دەڵێ: «من (نەبوون)م ناوێ، بەڵکو مانەوەم دەوێ با لە دۆزەخیشدا بێت»!] [(٣)].

هەر بە منداڵیی حەزی لە سەربەرزیی و جوامێریی بوو، بە هیچ شێوەیەک چارەی ستەم و زوڵم و سەرشۆڕیی و ژێرچەپۆکیی نەئەویست..

ئەم ڕەوشتە موسڵمانانە ڕۆژ بە ڕۆژ تیایدا بەهێز ئەبوو، بە هۆی ئەو هێزە مەعنەوییەوە کە لە ئیسلامی بێ‌گەردی وەر ئەگرت، تا کە بوو بە پیاوی ناو پیاوان، بەڵکو سەرکردەی پیاوان، ئەم ڕەوشتە لە هەموو هەڵس و کەوتێکیا ڕەنگی ئەدایەوە، بە تایبەت کاتی بەیەک‌گەیشتنی بە کاربەدەست و لێ‌پرساوان.

(٢) خوا پێ داو بوو وا تەمەنی منالیی و یاریی کردن و خۆخلافاندنی نەبوو، ڕاستەوخۆ پیاوانە بیری ئەکردەوە، هەتا ئەوە بوو لە تەمەنی منالّیدا بروانامەی زانایەتیی وەرگرت و هاوشانیی گەورەترین زانای ئەکرد، وەک بلێی کاری زۆر گەورە و گرنگ وا لە ئەستۆیا و درەنگیەتی تا فریای ئەنجام دانی بکەوێت.. جا چونکە خەم و خەفەتی هیدایەتی جیهانی ئیسلامیی، بگرە مرۆڤایەتیی بە تێکڕا، لە سەر شانی بوو، پێویست بوو بە بێ وەستان و بە بێ خەریک بوون بە کاری دنیاوە، هەوڵ بدا، چونکە هەتا شەپۆلی ئیلحاد زۆر و بە گوڕم ئەبوو، پلەی ئیمانیی و تێ گەیشتنی ئەمیش لە زیاد کردنا بوو.

(٣) پەیامی «بەری درەختی ئیمان» مەسەلەی هەشتەم. ل ٨٦-٨٧ چاپی یەکەم.

[ ٢ ] پێگەیشتنی:

هەر چەندە بنەماڵەکەی خەریکی کشتوکاڵ بوو، بەڵام ئەم بەرەو زانیاریی و فێربون رووی نا، سەرەتا لە حوجرەی گوندی «داغ» لە سەر دەستی مامۆستا «موحەممەد ئەفەندیی» لە ساڵی (١٨٨٢)دا دەستی دایە وانەخوێندن و بە لای مەلا عەبدوڵڵای براگەورەیشیەوە لە پشووی هەفتەدا وانەی تری وەر ئەگرت(٤).

بەڵام لە قوتابخانەی ئەم دێیەدا زۆر نەمایەوە بە بۆنەی شەڕپێفرۆشتنی قوتابیەکی تەمەن گەورەوە، بۆیە لە دێی «پیرمس» لە ژێر چاودێریی مامۆستا «نوور موحەممەد »دا، لە سەر وانەکانی بەردەوام بوو، دیسان لەوێیش قوتابیی لاسار وازیان لێ نەهێنا بۆ خۆی وانە وەرگرێ، ئەوە بوو چوار قوتابیی کەوتنە شەڕپێفرۆشتنی و رێپێگرتنی.. کە ئەمیش بە دەستیانەوە بێزار بوو چووە لای مامۆستا «نوور موحەممەد » و پێی وت:

ـ مامۆستا گیان تکات لێ ئەکەم بەو چوار قوتابیە بڵێی بە هەر چواریانەوە گەلەکۆمەم لێ نەکەن، بەڵام با دوو دوو بێن!

مامۆستا ئەم وتە ئازایانەی ئەم قوتابیە بچکۆلەی پێ خۆش بوو، بۆیە پێی وت:

ـ تۆ قوتابیی خۆمی! لە بەر ئەمە رێگا نادەم کەس رێت پێ بگرێ.

ئیتر لەو رۆژەوە «سەعیدە بچکۆل» ناونرا بە «قوتابیی مامۆستا ».

جا هەر چەندە سەعیدە بچکۆل لەم قوتابخانەیەدا زۆر نەمایەوە، بەڵام ئەم ماوە کەمە بەس بوو تا سەرنجی مامۆستاکەی ڕاکێشێ و بەوپەڕی ڕێز و سەرسوڕمانەوە سەیری بکا، چونکە لە ڕاستییدا لە هەموو لایەنێکەوە قوتابیەکی ناوازە بوو.. لە ڕەوشتیا، لە ئازایەتیيا، لە زیرەکیی و زانییندا ـ بۆیە مامۆستاکەی بڕیاری دا ســەرێک لە دایک و باوکی ئەم مناڵە، کە لە هەموو شتێکدا سەیر و جیاوازە، بدات و پرسیاریان لێ بکات ئەم مناڵەیان چۆن پەروەردە کردووە و چۆن بەم شێوەیە پێیان گەیاندووە؟.

ماوەی نێوان قوتابخانە و دێی «نوورس» پێویستیی بە شەش حەوت سەعات ڕێگا بڕین بوو بە پێ و بە ناو چیا سەختەکاندا، بەڵام سەعیدی بچووک بە ڕادەیەک کاری کردبووە سەر دڵی مامۆستا، بڕیاری دا ئەم هەموو ماندوێتیە بخاتە بەر خۆی و چەند پیاوێکی گوندەکەی و، بــە پێ خۆیان بگەیەننە گوندی «نوورس».

---

(٤) صۆفی میرزا حەوت مناڵی هەبوون کە ئەمانەن: دریە و خانم و عبدالله و سەعید و محمد و عبدالمجید و مەرجان.






نەخشەیەک دەست نیشانی شوینی ئەو شارانە ئەکات کەوا لەم پەرتووکەدا ناویان باسکراوە هەروەها شوینی ئەو گوندەی کەوا مامۆستای بەریز تیایدا لە دایک بوو.



وێنەی مامۆستا «بدیع الزمان» لە کۆتایی جەنگی جیهانیی یەکەمدا.

گەیشتنە بەرەوە و ماڵی صۆفی میرزایان دۆزییەوە. کە دایان لە دەرگا، دایکی سەعید هاتە دەرەوە و هەواڵی دانێ کە کاتی ئەوەیە باوکیشی لە کێڵگەوە بگەڕێتەوە. دوای ئەوە حەسیرێکی لە ژێر سێبەری دارێکی بەر ماڵەکەیاندا بۆ میوانەکانی ڕاخست. مامۆستا پرسیی:

- ئەم منالەتان چۆن پێ گەیاندووە؟

دایکی وەلامی دایەوە:

- *کاتێ سەعید لە سکما بوو هیچ کاتێکم بە بێ دەستنوێژ بە سەر نەبردووە، کاتێکیش هاتە دنیاوە بە بێ دەستنوێژ شیرم نەداوەتێ.*

دوای کەمێ صۆفی میرزا دەرکەوت و دوو مانگا و دوو گاجووت لە بەریەوە، بەرەو ماڵ گەڕایەوە.. بەلام مامۆستا نوور موحەممەد و هاوەلانی واقیان وڕ ما کە دییان وا دەمی ئاژەلەکان بەستراوە.

باوکی سەعید بەخێرهاتنێکی گەرمی میوانەکانی کرد و ئەوانیش بە دیتنی ئەو دیمەنە سەیرە خۆیان پێ نەگیرا، پرسیاریان کرد: کە بوچ دەمی ئاژەلەکانی بەستووە؟ پێی وتن:

کێڵگەکەم کەمێ دوورە، جا ناچار ئەبم لە هات و چۆدا بە لای کێڵگەی دراوسێکانما تێپەڕ ببم، بۆیە دەمی ئەم ئاژەلانە ئەبەستم تا لە گژ و گیا و رووەکی ئەم کێڵگانە نەخۆن، چونکە نامەوێ پاروویەک حەرام بێتە ماڵەکەمەوە.

مامۆستا نوور موحەممەد و هاوڕێیانی بە چاو و گوێی خۆیان شێوەی پەروەردە و پێگەیاندنی سەعیدیان بینی و بیست، وە تێ گەیشتن سەعید لە نێو ئیمان و ڕەوشتبەرزیی و شەرمی خوادا گەورە بووە، وە دایک و باوکێ بەو پلەیە خۆیان لە حەرام بپارێزن و ملکەچی فەرمانی شەریعەت بن شایانی ئەوەن خوای پەروەردگار ڕۆڵەی وا زیرەک و ڕەوشتبەرزیان پێ ببەخشێ.

میوانەکان ئەو شەوەیان بە خۆشیی بردە سەر و بۆ بەیانیی گەڕانەوە دوا.

یاسای قوتابخانەکانی ئەو ڕۆژەی کوردستان بەم جۆرە بوو: کە هەر زانایەک بڕوانامەی وەرگرتایە مافی ئەدرایێ قوتابخانە بکاتەوە، جا ئەوەی کە قوتابخانەکەی دامەزراند بوو ئەگەر دەسەلاتی بوایە ئەوا خەرجی قوتابییەکان لە ئەستۆیا ئەبوو، ئەگەر نا بە زەکات و دەستگرۆیی موسڵمانان کاروباری قوتابیان جێ بەجێ ئەکرا. بۆیە قوتابیانی قوتابخانە ئایینیەکان بە دێهاتەکانا بلاوەیان ئەکرد بۆ کۆکردنەوەی زەکات و بەشی خەرج و مەسرەفیان. بەلام سەعیدی بچووک و تازەپێگەیشتوو ئامادە نەبوو زەکات و خێر و صەدەقە وەر

بگرێ، بۆیە کە هاوەڵە قوتابیەکانی بە دێهاتەکانا بلاوەیان کرد بۆ کۆکردنەوەی زەکات و صەدەقە، ئەو نەچوو لەگەڵیانا، ئەمە کارێکی جوانی کردە سەر دڵ و دەروونی دانیشتوان و بە چاوێکی ڕێزەوە سەیریان ئەکرد، لەبەر ئەوە لە نێوان خۆیانا هەندێ پارەیان بۆ کۆ کردەوە و پێشکەشیان کرد، کەچی ئەوەیشی هەر وەرنەگرت، تا ناچار بوون بیدەن بە مەلا عەبدوڵڵای برای(٥).

## [٣] خەوی پیرۆز:

کە زستان هات، زستانی بەفری زۆر و سەهۆڵبەندان، کە بەو بۆنەوە ڕێگای نێوان گوندەکان ئەگیرێ، سەعیدی قوتابیی لە ماڵەوە لای دایک و باوکی دانیشت. بەلام لەو زستانەدا ڕووداوێکی گرنگی هاتە بەردەم:

خەوێکی بینی کە تا کۆتایی ژیانی هەر لە یادی بوو، لە خەویا قیامەت بە سام و ترس و لەرزیەوە هاتە کایەوە و هەموو خەڵکیی کۆ کرانەوە.. ئەمیش بە گەرمیی حەزی لە دیتنی پێغەمبەر بوو ﷺ. بەلام چۆن ئەتوانێ و لە کوێ پێی بگا لەم قەڵەباڵغیەدا ؟! لە کاتێکا بیری لەوە ئەکردەوە و چاوی بە ناو خەڵکەکەدا ئەگێڕا، بیری چوون بۆ سەر پردی سیراط هات بە دڵیا. بەڵێ، بێ گومان پێغەمبەری بەڕێز ﷺ لەوێوە تێ ئەپەڕێ.. بە پەلە خۆی گەیاندە پردی سیراط و وەستا و چاوەڕوانیی ئەکرد.. پێغەمبەرە بەڕێزەکان - سەلام و ڕەحمەتی خوایان بە سەرا بباریێ - بە لایا تێپەڕیان کرد و دەستی یەکە یەکەیانی ماچ کرد، دوای ئەوە پێغەمبەری بەڕێز ﷺ هات و سەعیدی بچکۆلەیش خۆی خست بە سەر هەردوو دەستیا و ماچی کردن و دوای ئەوە داوای «زانستیی» لێ کرد، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو:

**« زانستیی قورئانت پێشکەش ئەکرێت بەو مەرجەی «سوئال» لە هیچ کەسێکی ئومەتەکەم نەکەیت »**(٦).

(٥) ئەمە یاسای سەرانسەری ژیانی بوو کە هیچ دیارییەکی بە بێ بەرامبەر لە کەس وەر نەئەگرت.

(٦) وشەی «سؤال»ی عەرەبیی دوو واتای هەیە: یەکەمیان: پرسیار و دووهەمیان: سواڵکردن. مامۆستا بە درێژایی تەمەنی ئەم مەرجەی بە هەردوو واتاکەی بردە سەر. ئەوە بوو کە لەگەڵ زانایاندا دەکەوتە گفتوگۆ هەرگیز پرسیاری نەدەکرد بەڵکو تەنها وەلامی ئەوانی دەدایەوە، چونکە دەترسا مەرجەکەی و دڵی ئەوانیش بشکێنێ بە پرسیارێ وەلامەکەی نەزانن. دیارە بە واتای دووەمیش هیچ شتێکی لە سەرانسەری ژیانیدا بێ بەرامبەر لە هیچ کەسێ وەرنەگرتووە و بە سەربەرزیی ژیاوە.

## [ ٤ ] وەرگرتنی بڕوانامەی زانایی:

لە ساڵی (١٨٨٥ز) دا چوو بۆ «بەدلیس» تا لە قوتابخانەی مامۆستا ئەمین ئەفەندیی بخوێنێ، لەوێیش زۆر نەمایەوە، چونکە لە بەر کەمیی تەمەنی، مامۆستا ئامادە نەبوو خۆی وانەی پێ بڵێ و دایە دەست کەسێکی تر و ئەمە کاری کردە سەر دڵی و بەرەو قوتابخانەی «میرحەسەن وەلیی» لە «موکوس» کەوتە ڕێ. دوای ئەوە بۆ قوتابخانەی «واسطان» لە «گەواش». دوای تاقە مانگێک لەگەڵ هاوەڵێکیا، کە ناوی مەلا موحەممەد بوو، چوو بۆ قوتابخانەیەک لە قەزای «بایەزید»ی پارێزگای ئاغری «أرضروم». ئا لەم قوتابخانەیەدا بوو خوێندنی بنەڕەتیی لە ژیانی مامۆستا نوورسییدا دەستی پێ کرد، چونکە لەوە و پێش جگە لە وانەی «نحو و صرف» هیچی تری نەخوێندبوو.

لەم قوتابخانەیەدا و لە ژێر چاودێریی مامۆستا «موحەممەد جەلالیی» دا، سێ مانگی سەرەمڕ و بێ‌پشووی خوێندنی بە سەر برد و هەموو ئەو پەڕاوانەی کە لەم جۆرە قوتابخانانەدا ئەخوێنران تەواو کرد.. بە مەرجێ تەمەنی لە نێوان (١٢-١٣) ساڵییدا بوو.. هەموو ڕۆژێ لە گران‌ترین پەڕاو دووصەد لاپەڕەی ئەخوێند و بە چاکیی لێی تێ‌ئەگەیشت بێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر هیچ ڕاڤە و پەراوێزێک.

بە شەو و بە ڕۆژ سەرگەرمی کارەکەی بوو، بە ڕادەیەک لەم کاتانەدا لە جیهانی دەرەوە دابڕ بوو بوو و زۆربەی کاتی - بە تایبەت بە شەوانا - لە تەنیشت گۆڕی بوێژی خوادۆست ئەحمەدی خانییدا[7] ئەبردە سەر. هەتا شەوێکیان لای هاوەڵەکانی دیار نەبوو، هەموو شوێنێ بە دوایا گەڕان، دوایی لای گۆڕەکە دۆزییانەوە سەیریان کرد وا بە دیار ڕووناکیی مۆمێکەوە ئەخوێنێتەوە.

بە تەواوکردنی سێ مانگ، زانیاریی تەواو کرد و لای مامۆستا موحەممەد جەلالیی بڕوانامەی عالمیی وەر گرت.

مامۆستا نوورسیی لە ساڵی ١٨٨٦ز دا چوو بۆ بەدلیس و دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە و ئامادەی وانەکانی مامۆستای پێشووی موحەممەد ئەمین ئەفەندیی

(٧) ئەحمەدی خانیی: (١٦٥١-١٧٠٦ز) کەڵەشاعیر و زانا و خواناسی کوردە، داستانی (مەم و زین) کە بەرزترین و زەق ترین بەرهەمیەتی، چۆڕاوەی تێ گەیشتنی خۆی دەربارەی ئایینی ئیسلام و ژیان و مێژوو و هەموو کاروبار و جم‌وجووڵی سەردەمی خۆی تێدا تۆمار کردووە. بێجگە لەوەی کە (عەقیدەی ئیسلامیی) لە نامیلکەیەکدا بە شیعرێکی ناسک هۆنیوەتەوە.

نەبوو، جا کاتێ ماموٚستاکەی داوای لێ کرد جلوبەرگی زانایان لە بەر بکا، ئەم خوٚی بە شیاو نەزانی، بوٚیە وتی:

**- من هێشتا بالغ نەبووم ماموٚستا گیان، جا چوٚن بوٚ من دروستە جلوبەرگی ماموٚستا بەڕێزەکان لە بەر بکەم، وە چوٚن ئەتوانم، کە من هێشتا منالم، بە دیمەنی زانایان خوٚم دەر خەم ؟!**

دوای ئەوە چوو بوٚ شاری شیروان بوٚ لای مەلا عەبدوللای برای کە لەوێ خەریکی خوێندن بوو. چەند مانگێ بوو یەکتریان نەبینی بوو، بە یەکتر شاد بوونەوە و دوای ئەوە مەلا عەبدوللا لێی پرسیی:

- دوای دوایین بەیەک گەیشتنمان «شرح الشمسية»[8]م تەواو کردووە، ئەی توٚ ئێستا چی ئەخوێنی؟

**- هەشتا پەڕاوم خوێندووە.**

- چی؟

**- بەلێ، هەشتا پەڕاوم خوێندووە، چونکە زیاد لە پەڕاوەکانی خوێندن پەڕاوی تریشم خوێندووە.**

- کەواتە تاقییت ئەکەمەوە.

**- ئامادەم بوٚ تاقیکردنەوە.. چیت پێ خوٚشە بپرسە!**

مەلا عەبدوللا تاقیکردنەوەیەکی وردی ماموٚستا نوورسیی کرد و بە تەواوەتیی سەرسام بوو، ئەو برا بچکوٚلەیەی کە هەشت مانگ لەوەوبەر قوتابیی خوٚی بوو ئێستا زانایەکی بەرزی لێهاتووی تەواو ئاگاداری لێ دەرچووە. سەیر لەوەدا بوو مەلا عەبدوللا داوای لێ کرد لەمەولا کاکی بکا بە قوتابیی خوٚی!

ماوەیەک «مەلا سـەعید» لەگەل مەلا عەبدوللای برایا مایەوە و دوای ئەوە چوو بـوٚ «سـیعرد» و چووە قوتابخانەکەی ماموٚسـتای بەناوبانگ فەتحوللا ئەفەندیی. لەوێ ئەم پرسیار و وەلامە لە نێوانیانا ڕووی دا:

- سـالی ڕابوردوو پەڕاوی سیووطییت ئەخوێند ئایا ئەمسال جامیی ئەخوێنی؟[9].

**- بەلێ، تەواوم کردووە.**

---

(٨) شرح الشمسية کتێبێکە لە «منطق»دا.

(٩) مەبەست لە (سیوطي) ڕاڤەی ئەو هەزار دێڕە هوٚنراوەیەی ڕێزمانی عەرەبییە کە پێی ئەلێن: «ألفية ابن مالك»، وە (جامي)ش پەڕاوێکی بەناوبانگی (نحو)ە. لە هەندێ ناوچەدا سیووطیی پێش جامیی دەخوێنرێ.

مامۆستا فەتحوڵڵا هەر پەڕاوێکی هەڵ ئەدا مامۆستا نوورسیی وەڵامی ئەدایەوە: تەواوم کردووە، بەڕادەیەک گومان کەوتە دڵی مامۆستاکەیەوە: کەسێ چۆن ئەتوانێ لە ماوەیەکی کەمدا ئەم هەموو کتێبانە بخوێنێ؟ بۆیە خۆی پێ نەگیرا و بە گاڵتەوە پێی وت:

- پار شێت بوویت، ئایا ئێستاش هەر شێتی؟

مامۆستا نوورسیی کە ئەمەی بیست، ئامادەیی خۆی دەربڕیی بۆ تاقیکردنەوە لەو پەڕاوانەدا. ئەوە بوو بۆ هیچ پرسیارێکی مامۆستاکەی دانەما و بە جوانیی وەڵامی دایەوە. ئەویش سەرسام بوو و بە لایەوە زۆر سەیر بوو، لە دواییدا پێی وت:

- چاکە.. زیرەکییەکەت بێوێنەیە، بەڵام با بزانین هێزی لەبەرکردنت چۆنە؟ ئایا ئەتوانی چەند دێڕێک لەم پەڕاوە دوو جار بخوێنیتەوە و لەبەریان کەیت؟

پەڕاوی «مقامات الحريري» بۆ درێژ کرد تا بۆ تاقیکردنەوە چەند دێڕێکی تیا بخوێنێتەوە.

مامۆستا نوورسیی پەڕەیەکی یەک جار خوێندەوە و سەیری کرد بەسیە بۆ لەبەرکردنی، دیسان مامۆستاکەی سەرسام بوویەوە و وتی:

*«کۆبوونەوەی زیرەکیەکی بێوێنە لەگەڵ هێزی لەبەرکردنێکی بێوێنە شتێکی زۆر دەگمەنە».*

هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندنی پەڕاوی «جمع الجوامع»(١) بە ڕێژەی کاتژمێرێک یان دوان لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەی حەفتەیەک. تەنها ئەم خوێندنەوە بەس بوو بۆ ئەوەی پەڕاوەکە بە یەکجاریی لەبەر کا. کاتێ مامۆستا فەتحوڵڵا ئەفەندیی ئەمەی دیی لە سەر بەرگی پەڕاوەکەی نووسیی:

(لقد جمع في حفظه «جمع الجوامع» جميعه في جمعة)..

مامۆستا نوورسیی ڕۆژ بە ڕۆژ ناوبانگی دەر ئەچوو و لە هەموو لایەکەوە زانایانی لێ کۆ ئەبوونەوە تا بە پرسیاری جۆراو جۆر و قورس تەنگی پێ هەڵ چنن، کەچی هەر هەموویانی ئەبەزاند و وەڵامی ئەدانەوە، تا ئەوە بوو ناویان نا «سەعیدی مەشهوور».

ناوبانگ دەرچوونی مامۆستا کاری کردە سەر دڵی هەندێ لە قوتابییە ئایینیەکان و پێیان ناخۆش بوو وا قوتابیەکی غەریبی مناڵ ئەو هەموو ناوبانگ و ڕێزەی لە شارەکەیانا هەبێ، بۆیە ویستیان ئازاری بدەن، بەڵام دانیشتوان

(١) جمع الجوامع: لە ئوصولی فیقهەوە تاج الدینی سەبوکیی شافیعی، کە لە ساڵی ٧٧١ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە، دای ناوە ئەڵێن: لە سەد پەڕاوی ئوصولی فیقە کۆی کردۆتەوە، ڕاڤە و پەراوێزی زۆری هەیە.

نەیان هێشت و بە گورجیی هەواڵ گەیشتە پارێزگاری شار و هێزێکی ژاندرمەی نارد تا هیچ ڕوو نەدات و مەلا سەعیدی بۆ بانگ کەن و ئەو قوتابیانەش ئاگادار کەن لە سەر ئەم کارە نالەبارەیان لە شار دەرکرێن. بەڵام مامۆستا، مامۆستایانە، بە سەرۆکی ژاندرمەی وت:

- ئێمە قوتابیین، جاری وا ئەبێ یەکێکمان لەگەڵ یەکێکی ترمانا تێک ئەچێ و دوای ئەوە لە نێوان خۆمانا ئاشت ئەبینەوە، لە بەر ئەوە بە گونجاوی نازانم کەسی تر لە دەرەوەی ڕێبازەکەمانەوە دەست بخاتە کارمانەوە. لە بەر ئەمە بە پێویستی نازانم بێم لە گەڵتانا بۆ لای پارێزگار و تکاتان لێ ئەکەم پێی ڕاگەیەنن کە هەڵەکە لە منەوە بوو.

دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ شاری «بەدلیس» و لەوێوە بۆ شاری «تیللو» کە بۆ ماوەیەک لە یەکێ لە پەرستگاکاندا ئیعتیکافی کرد و لەوێدا لە فەرهەنگی «القاموس المحيط»ی فەیرووزئابادیی تا بابی سینی لەبەر کرد. ئەو فەرهەنگە پەراوێکە پانیی (١٢) سم و درێژیی (٢٣) سم و هەر لاپەڕەیەکی (٢٤) دێری تیا نووسراوە. مامۆستا نزیکەی (٥٩٢) لاپەڕەی تیا لە بەر کرد.

## [ ٥ ] وت و وێژ لەگەڵ موصطەفا پاشا:

مامۆستا لە پاڵ زیرەکییدا زۆر ئازا و چاونەترس بووە، گیانی پاڵەوانێتیی لە هەموو ئەندامێکیا دیار بووە. بە ڕادەیەک ئازا بوو کەس نەبوو ئەو لێی بترسێ هەر چەندە هێشتا لە تەمەنی لاوییدا بوو.

موصطەفا پاشا سەرۆکی عەشرەتی «میران»ی ناوچەی جەزیرە بوو، دانیشتوان بە تەواوەتیی بە دەست زوڵم و لەخۆبایی‌بوونیەوە گیریان خوارد بوو.

شەوێکیان مامۆستا نوورسیی لە خەویا شێخ عەبدولقادری گەیلانیی بینی کە زۆری خۆش ئەویست، پێی وت:

*- مەلا سەعید! بڕۆ بۆ لای موصطەفا پاشای سەرۆک عەشرەتی میران و بانگی بکە بۆ سەر هیدایەت و بۆ وازهێنان لە زوڵم و بۆ بەجێ‌هێنانی نوێژ، وە ئامۆژگاریی بکە بە فەرمان‌دان بە چاکە، جا ئەگەر بە گوێی نەکردی بی‌کوژە.*

بەیانیی زوو مامۆستا بەرەو جەزیرە کەوتە ڕێ، کە پاشا لەوێ نەبوو زانی وا لەسەر کێڵگەکەی، سەرکەوتە سەر بانەکە و چووە چادرەکەیەوە و لەوێ نەبوو، کە پاشا هاتەوە دانیشتوان هەموو بەرزەپێ لە بەری هەڵسانەوە جگە لە مامۆستا.. (پاشا) زۆری پێ ناخۆش بوو، کە زانیی مەلا سەعیدی مەشهوورە، پرسی:

- بۆچی هاتوویت؟
- (بە متمانەوە) **هاتووم تا بانگت بکەم بۆ سەر هیدایەت.. پێویستە لە سەرت واز لە زوڵم بێنی و دەست بکەیت بە نوێژ.**
سەرسوڕمان و تووڕەیی پاشا زیاتر بوو..
- ئەی ئەگەر وام نەکرد؟
- (بە هەمان دامەزراوییەوە) **ئەت کوژم!.**
بێدەنگیی باڵی کێشا بە سەر دانیشتوانا. زوربەیان بە لایەوە مەسوگەر بوو تازە گەنجی بەناوبانگ تیا چوو. پاشایش فووی تێ کرا بوو، ناچار بوو لە چادرکە چووە دەرەوە و کەمێ پیاسەی کرد تا تووڕەییەکەی لا چێ، دوای ئەوە گەڕایەوە.
دوای پرسینەوە لە هۆی هاتنی، ئیشارەتی کرد بۆ شمشێرەکەی مامۆستا و بە گاڵتەوە وتی:
- بەم شمشێرە پیسە ئەمکوژی؟
- **شمشێر نابڕێ.. بەڵکو دەستە کە ئەبڕێ..**
پاشا خەریک بوو لە داخا بتەقێ.. چووە دەرەوە.. تا ئێستا بە خراپە دەستی بۆ هیچ زانایەک درێژ نەکردبوو، کەچی وا ئەم مامۆستا گەنجە خەریکە ناچاری ئەکا خوێنی بڕێژێ. خوێنی چ مامۆستایەکیش؟ هی سەعیدی مەشهوور کە ڕەنگە زوربەی شوێنکەوتووەکانی خۆشیان بوێ.
لە دەرەوەی چادرەکە بیرێکی بۆ هات و تووڕەییەکەی نیشتەوە، بۆیە هاتەوە ژوور و وتی:
- لە ناوچەی جەزیرەدا زانام هەن و بەرابەرکێیەک لە نێوان ئەوان و تۆدا ڕێک ئەخەم، جا ئەگەر توانیت زاڵ بیت بە سەریانا هەرچیت پێ وتووم ئەی کەم، بەڵام ئەگەر ئەوەت نەتوانی ئەوا ئەت خەمە ڕووبارەکەوە.
- **وەک من مافی ئەوەم نیە بڵێم بە سەر هەموو زانایاندا زاڵ ئەبم، تۆیش مافی ئەوەت نیە من بخەیتە ڕووبارەکەوە. جا ئەگەر توانیم وەڵامی هەموو ئەو زانایانە بدەمەوە، من داوای ئەوەت لێ ئەکەم تفەنگە ماوزەرەکەتم بدەیتێ، چونکە ئەگەر پارێزگاریی بەڵێنەکەت نەکەیت. بەو تفەنگە دەتکوژم.**
هەموان لە کێڵگەوە گەڕانەوە شار و پاشا ناردی بە شوێن زانایاندا تا ئامادەی بەرابەکێ بن.
پاشا پەلەی بوو مامۆستای گەنج ببەزێ و بشکێ و ئەوسا ئەویش بتوانێ تۆڵەی لێ بسێنێ.

مامۆستا نووڕسیی زۆر ماندوو بوو، بۆیە داوای کرد شوێنێکی بۆ تەرخان کەن بۆ خەوتن، چونکە باکی لە تاقی‌کردنەوە نەبوو و پێویستی بە پیاچوونەوە و خۆئامادەکردن نەبوو. بەڵام زاناکانی تر دەستیان کرد بە پشکنینی پەڕاو و هەڵبژاردنی پرسیاری قورس. دوای چەند سەعاتێک کە چاوی کردەوە وتیان: کۆڕ بەستراوە و زانایان ئامادەن و پاشایش چاوەڕوانە.

سەلامێکی لە کۆڕ کرد و دانیشت. کە چایان بۆ هێنرا هیچ زانایەک ئاگای لە خۆی نەبوو تا چایەکەی بخواتەوە، خەریکی پشکنینی پەڕاو و چپە و پرسیار بوون. مامۆستا لە سەر خۆی چایەکەی خۆی خواردەوە، وە بۆ گاڵتەیش چای سیان چوارێکی خواردەوە بێ ئەوەی ئەوان لەبەر سەرقاڵی بە خۆیان بزانن!.

پاشایش بە وردیی ئاگای لە کۆڕەکەیەتی، مامۆستا دای بە گوێیانا ئەم پرسیار ناکا با دڵ ئاسوودە بن، بەڵکو ئەم ئامادەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئەوانە. بە هەموویانەوە نزیکەی چل پرسیاری قورسیان بۆ هەڵبژارد و ئەمیش بە ئاسانیی وەڵامی دانەوە. بە ڕادەیەک هەندێکیان ئامادەبیان دەر بڕیی ئەم وانەیان پێ بڵێتەوە. پاشایش بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر و تفەنگەکەی پێشکەش کرد و نوێـژی بـەجێ هێنا و ڕەفتـاری چـاک کـرد ، بـەڵام ئـەڵێن دوایی هەڵگەڕاوەتەوە.

## [٦] نازناوی «بدیع الزمان»:

هێشتا تەمەنی مامۆستا لە شانزە ساڵیی تێ‌پەڕی نەکردبوو .. لە ساڵی ١٨٨٩ دا چوو بۆ «ماردین» و لە مزگەوتی جومعەی شارەکەدا دەستی بە وانەوتنەوە کرد و وەڵامی پرسیاری موسڵمانانی ئەدایەوە. هەندێ ئەم ناوبانگ دەرکردن و ئەو ڕێز و پایەبەرزییەیان پێ‌خۆش نەبوو، بۆیە نادر بەگی والیی شار دژی پڕ کرا: کە ئەم پیاوە مەترسیی دارە و لە شارەکەدا ئاژاوە بەرپا ئەکا، ئەویش بڕیاری دا لە «ماردین» دووری خاتەوە. بە بێ تاوان مامۆستای بەڕێز هەردوو دەسـتی لـە لایەن پۆلیسەوە کۆت کرا و بەرەو شاری «بەدلیس» برا(١١).

---

(١١) بە ڕاستیی ژیان بردنە سەر لە خزمەتی بیروهەستی مامۆستادا پڕە لە خێر و بەرەکەت و دڵخۆشییدانەوە بە بۆنەی ئەو لێ‌بڕانەیەوە بۆ خزمەتی قورئانی پیرۆز. لە کاتی نووسینی ئەم لاپەڕەیەدا زۆر کەڵکم لێ وەرگرت، چونکە لە زرووفێکی ناهەمواردا دەژیاین، کەچی بەش بە حاڵی خۆم سنگ‌فراوانیی و دڵخۆشیم بۆ هات، هەروەک هیچ شتێک لە ئارادا نەبێ. (١٩ی ربیع الاول ٩.١٤، ٣٠/١٠/١٩٨٨)

والیی شاری «بەدلیس» ئەو کاتە عومەر پاشا بوو، کە حەزی لە زانیاریی ئەکرد و خاوەنی پەڕاوخانەیەکی گەورە بوو، دوای ماوەیەکی کەم پایەبەرزیی مامۆستای بۆ دەرکەوت، بۆیە بە دڵ خۆشی ئەویست و بە گەرمیی داوای لێ کرد لەماڵەکەی خۆیا لە گەڵیا ژیان بداتە سەر. لە سەرەتاوە نارازیی بوو بچێتە پاڵ والیی، بەڵام ئەوەندەی دووبارە کردەوە مامۆستای ناچار کرد ڕەزامەندیی بنوێنێ. بەمە ژوورێکی بۆ تەرخان کرد.

دەروو لە مامۆستا کرایەوە، دەرووی بە خێری لێ کرایەوە، هەلی بۆ هەڵ کەوت تا دەست بداتە خوێندنەوەی پەڕاوێکی زۆر و لەبەرکردنی هەندێکیان. هەروەها دەستی دایە خوێندنەوەی چەند پەڕاوێک لە بارەی «علم الكلام ومنطق ونحو وتفسير وحديث وفقه» وە پتر لە هەشتا لە کەڵە پەڕاوە زانستییە ئیسلامییەکانی لەبەر کرد.

لەم شارەدا هەموو ڕۆژێ خەریکی پیاچوونەوەی ئەو پەڕاوانە بوو کە لە بەری کردبوون، سێ مانگ جارێ پیاچوونەوەیەکی هەموویانی تەواو ئەکرد. هەر لەم شارەدا دوا وانەی ئاینیی لە مامۆستای بەڕێز (موحەممەد کەفرەوییەوە) وەرگرت.

لە ساڵی ١٨٩٤ دا (حسن پاشا)ی والیی «وان» داوای لێ کرد بچێتە پاڵی و لە لای بمێنێتەوە، ئەوە بوو ڕۆشتەو، دوای ئەویش لە ماڵی (طاهر پاشا)دا. لەوێ لە قوتابخانەی «خورخور» دا نزیکەی بیست ساڵ دەرسی وتەوە، لەم ماوەدا زانای زۆر لە ژێر دەستیا پێ گەیین. بەینا و بەینیش ئەچوو بۆ ناوچەکانی دەور و بەرو دانیشتوانی لادێکانی ئامۆژگاریی ئەکرد، وە خوای گەورە هەلی بۆ ڕێک خست تا هەندێ مامۆستای زانستە تازەکان وەک جوگرافیا و کیمیا و ئەوانی تر ببینێ، کاتێ مامۆستا ویستی گفتوگۆیان لە گەڵا بکا هەستی بە کەمتوانایی خۆی کرد، چونکە نەشارەزای ئەو جۆرە زانستانە بوو و بۆی دەرکەوت کە «علم الكلام»ی کۆن بۆ ئەم چەرخە دەست نادات.

ئەمە پاڵی پێوە نا تا ئەوپەڕی هەوڵ بدا بۆ فێربوون و وەرگرتنیان. بە ماوەیەکی کەم شارەزای بیرکاریی و گەردوونناسیی و کیمیاو فیزیا و جیۆلۆجیا و فەلسەفە و مێژوو و جوگرافیا بوو، بە ڕادەیەک بتوانێ پسپۆڕان ببەزێنێ و لە سەر ئەو بابەتانە پەڕاو بنووسێت.

جا هەروەک لە زانستە شەرعییەکاندا ناوبانگی زیرەکیی و لێهاتنی دەرچوو بوو، لە زانستەکانی تریشدا بە هەمان شێوە، تا ئەوە بوو نازناوی هەڵکەوتووی زەمانە «بديع الزمان»ی لێ نرا.

# زانکۆی زەهرا

## [ ١ ] هەواڵی دڵتەزێن:

لە کاتێکا مامۆستا نوورسیی لە شاری «وان»دا سەرگەرمی کاری سەرشانی بوو لە ئامۆژگاریی موسڵمانان و وانەوتنەوە، ڕۆژنامەکان هەواڵێکی سەیریان بڵاو کردەوە، هەواڵی «گلادستۆن»ی وەزیری ئینگلیز کە لە «ئەنجومەنی گشتیی بەریتانیی»دا ڕووی کردبووە ئەندامەکانی ئەنجومەن و دانەیەک لە قورئانی پیرۆزی بەرز کردبۆوە و وتبووی:

*« هەتا ئەم قورئانە بە دەست موسڵمانەکانەوە بێت ئێمە ناتوانین حوکم ڕانیان بکەین، لە بەر ئەوە چارمان نیە ئەبێ نەی‌هێڵین و لە ناوی بەرین یا پەیوەندیی موسڵمانەکانی پێوە ببڕین ».*

ئەم هەواڵە کارێکی زۆری کردە سەر دڵی مامۆستا نوورسیی، کافران چاویان قورئانی پیرۆز نابینێ.. قورئانی پیرۆز بە چقڵی چاویان ئەزانن. داماون وا بیر ئەکەنەوە.. نیازێکی خراپیان هەیە.. بێ‌باوەڕان زۆر زیانەخرۆن.. تێ‌نەگەیشتوون.. خۆیشیان و کەسانی تریش ئەخەنە ناو لیتەی نەگبەتییەوە.. ئاسایش و حەسانەوە لە زەوییدا هەڵ ئەگرن.. وا ئەزانن وا چاکە.. بە وێنەی شەمشەمەکوێرە توانای ڕۆژی ڕووناکییان نیە و ژیانی تاریکەشەو بە ژیان ئەزانن.

مامۆستا تێ‌گەیشت کافران لێ بڕاون بە هەوڵ و کۆششێکی بێ‌وچانەوە دژی ڕێبازی قورئان بجووڵێنەوە..

کافران ڕۆژیانە و وان لە پێش‌کەوتنا و لەوپەڕی دەسەڵات‌دا هەرەشە لە ئایینی موسڵمانەکان ئەکەن، کەچی موسڵمانان لە نەخوێندەواریی و دواکەوتوویی خۆیانا ئەتلێنەوە، دەوڵەتەکەشیان لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیا بوو چونکە کۆمەڵەکەیان توانای هەڵسووڕاندنی کاروباری نەبوو، بۆیە مامۆستا کە سەرنجی ئەم بارودۆخەی دا بینیی موسڵمانەکان زۆر بێ کەسن و کافرانیش دەم‌سوورن، لە دڵی خۆی‌دا بڕیاری دا هەموو ژیانی بۆ دەرخستنی گەورەیی قورئان تەرخان بکا و بە بەڵگەی زانستیانەی دەم‌کوت‌کەری چەرخی تازە بی‌سەلمێنێ فەرمایشتی خوایە و موسڵمانان بانگ کاتەوە بۆ سەری و، بی سەلمێنێ قورئان خۆرێکی مەعنەوییە و هەرگیز کڵپەی کز نابێت و کەسیش

نەتوانێ بی‌کوژێنێتەوە:
«لأبرهنن للعالم بأن القرآن شمس معنوية لايخبو ســناها ولايمكن إطفاء نورها».
بۆ ئەمە بڕیاری دا هەوڵی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا (واتە لە ناوچەی کوردستاندا) بدا، بە ناوی قوتابخانەی «زهراء» لە شێوەی زانکۆی ئەزهەر و دوو لقی هەبێ، یەکێ لە «بەدلیس» و یەکێ لە «دیاربەکر» بۆ خزمەتی قورئان و شان بە شانی زانستە ئیسلامییەکان زانستە تازەکانیش بخوێنرێن، چونکە پێویســتە موســڵمانان لــە دواکەوتن و نەخوێندەواریی ڕزگار بکرێن.
بۆ ئەمە لە ساڵی ١٨٩٦ز دا خۆی پێچایەوە و بەرەو شاری «ئەستەمبووڵ» کەوتە ڕێ، تا گەڵاڵەی کارەکەی بخاتە بەرچاوی کاربەدەستان. ماوەی ساڵ و نیوێک لە ماڵی دۆستێکیا مایەوە و خەریکی هەوڵ و کۆشش بوو تا بەشکوم دانی پیا بنرێ کەچی بێهوودە بوو و بە دەستی خاڵیی گەڕایەوە بۆ «وان».
مامۆستا ئاگای لە بێشوانیی و بێئاگایی موسڵمانەکان بوو، بۆیە بە غیرەتی ئیماندارێک کە خوا ئامادەی کرد بێ بۆ ئەو هەڵوێستە پڕ مەترسییە، قۆڵی لێ هەڵ ماڵی، تا بەربەستی ئەو لافاوە پڕ مەترسییە بکات کەوا خەریکە ئیمان و ئیسلام بە جارێ ڕیشەکەن کات.
بە نیاز و مەبەستی پیاوێکی شان هەڵ گرتوو بیری لە کارەکەی ئەکردەوە. بەڵام خوای گەورە بۆی ڕێک نەخست..
بۆی ڕێک نەخست چونکە بەندەی ئیمانداری بە چاکیی ئەناسێ و بە مەبەستی دڵی ئاگادارە.
لەوە ئەچێ خوای گەورە نەیویستبێ مامۆستا بەو کارەوە خەریک بێ، تا ئامادەی کا بۆ کاری گەورە تر.. ئەو قوتابخانەیە لەوانەیە ببوایە بە بەربەستێکی بچکۆلە بۆ ناوچەیەک، بەڵام جیهانی ئیسلامیی کەوتبووە ژێر شاڵاوێکی فیکریی کافران و بیروباوەڕی خواناسیی خەریک بوو لە ناو گۆمی ئیلحاددا نوقوم ببێت.
بۆیە خوای گەورە بۆ ئەم هەڵوێستە گران و پڕمەترسییەی ئامادە ئەکرد، ئەو کارە بچکۆلەیەی بۆ ڕێک نەخست، هەر چەندە مامۆستا خەم و خەفەتێکی زۆری ئەخوارد کە ڕێک نەئەکەوت و، هەر چەندە زۆر و زەبەندە پاڕابێتەوە لە خوا تا ڕێکی خا، ئەوەی بۆ ڕێک نەخست تا لەوە چاک‌تری بۆ ڕێک خا، تا دەرمانی تەواوی نەخۆشییەکەی پێ بسپێرێ. تا بەرە بەرە ڕۆح و گیانی ئامادە کا پەیامەکانی نوور بنووسێت..
بەندە تەنها مەبەستی بەرز و پاکی لە سەرە، ئیتر پەروەردگاری میهرەبان

خۆی نەخشەی تەواوی پێ ئەبەخشێ و خۆی چاکە دێنێتە ڕێ.
ئەوە بوو لە جیاتی زانکۆیەک چەندەها زانکۆی پێ بەخشی کە بریتیی بوو لە پەیامەکان و قوتابیانی نوور.

## [ ٢ ] وەڵامی هەموو پرسیارێ:

لە ســـاڵی ١٩٠٧ز دا جارێکی تر گەڕایەوە «ئەستەمبووڵ» لە ئوتێلی شەکرچی و لە ناوچەی «فاتح» (کە بە بۆنەی مزگەوتە بەناوبانگەکەی سەرکردەی موسڵمان و ڕزگارکەری «قسطنطينيه» لە دەستی ڕۆمەکان، سوڵتان «محمد فاتح»ەوە نـــاو نراوە)، دانیشـــت کە شـــوێنی زۆرێ لـــە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی وێنەی بوێژ «محمد عاكف» بوو[١].
لەو کاتەدا لە سەر دەرگای ژوورەکەی تابلۆیەکی هەڵواسیی بوو و تیایا نووسیی بوو:
**«لێرەدا وەڵامی هەموو پرسیارێ ئەدرێتەوە و هەموو گیروگرفتێکیش چارەسەر ئەکرێ بێ پرسیار کردن لە هیچ کەسێک»**[٢].
هەر چەندە مامۆستا ناوبانگی دەرچوو بوو، بەڵام ئەم نووسینە زیاتر سەیر بوو و سەرنجی خەڵکیی زۆر ڕا ئەکێشا.
حەســـەن فەهمی باش ئوغلو[٣] لە بیرەوەریەکانییدا دەربارەی ئەم باسە ئەگێڕێتەوە:
«کاتێ گەنجێک بە ناوی «بديع الزمان» هاتە ئەستەمبووڵەوە من لە قوتابخانەی «فاتح» ئەم خوێند. بیستم لە سەر دەرگای ژوورەکەی تابلۆیەکی هەڵ واسیوە تیایا ئەڵێ:
لێرە هەموو گرێیەک ئەکرێتەوە و وەڵامی هەموو پرسیارێک ئەدرێتەوە، بەڵام پرسیار لە کەس ناکات..
وا هاتە بیرما خاوەنی داوای وا ئەبێ شێت بێت، بەڵام ستایشی «بديع

---

(١) شاعیرێکی مەزنی موسڵمانی تورکیایە، سەرنووسەری گۆڤاری «الصراط المستقيم» و «سبيل الرشاد» بووە، هەڵ بژێررا بۆ نوێنەری پەرلەمان لە ئەنقەرە. کە یاسای جل‌وبەرگ لە ساڵی ١٩٢٥ دا لە تورکیا شەبقە لەسەرکردنی فەرز کرد، پێی ناڕازیی بوو و چوو بۆ میصر و لەوێ خەریکی وانەوتنەوە بوو لە زانکۆی قاهیرە. کە نەخۆشیی زۆری بۆ هێنا گەڕایەوە تورکیا و لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٦ دا کۆچی دوایی کرد.

(٢) مامۆستا بە درێژایی تەمەنی کەس نەی بینیوە پرسیار لە کەسێ بکا، بە بۆنەی ئەو خووەوە کە لە منالیا دی بووی و لە پێشەوە باس کرا.

(٣) لەمەودوا بۆتە ئەندام لە دەستەی ڕاوێژکاریی کاروباری ئایینیی کە هاوبەرابەری وەزارەتی ئەوقافە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا.

الزمان» لە لایەن هەمووانەوە لە قوتابیان و زانایان، ئەوانەی کە سەریان لێ دا بوو، کاری کردە سەر دەروونم تا حەز بکەم سەرێکی لێ بدەم، جا بڕیارم دا قورس‌ترین و وردترین پرسیاری بۆ هەڵ بژێرم تالێی بپرسم. ئەو کاتە من بە یەکێ لە قوتابییە پێش‌کەوتووەکانی قوتابخانە ئەژمێررام.

لە ئەنجامدا ـ ئێوارەیەکیان لەو پەراوانەدا کە باسی «عقائد» ئەکەن، هەندێ باسی گران و قورسم هەڵبژارد کە مەگەر وەلامیان بە چەندان بەرگی گەورە گەورە بدرێتەوە.

بۆ رۆژی داهاتوو سەرم لێ دا و پرسیارەکانم ئاراستەی کرد، بەراستیی وەلامەکانی سەیر و بەبرشت (خارق) و سەرسوڕهێنەر بوون، وەها وەلامی دامەوە هەروەک دوێنێ لە گەڵما بوویێ و سەیری پەراوەکانی کردبێ، بەمە دڵم پڕ بوو لە دڵنیایی و متمانە کە ئەم زانستەی، بە دەست‌خستن نیە ـ وەک زانستەکەی ئێمە ـ بەڵکو بەخششێکی خواییە».

زانایەکی تر کە ناوی «حسن أفندي» بوو و تەمەنی لە وانەوتنەوەدا بە سەر برد بوو و جگە لە تاقە رۆژێک لە وانەوتنەوە دوا نەکەوتبوو، کە ئەویش رۆژی سەردانی لە مامۆستا نوورسیی بوو سەری لە مامۆستا دا، بۆ رۆژی دووەم کە گەڕایەوە قوتابخانە بە قوتابیەکانی وت:

*« لە وێنەیم هەرگیز نەدیوە، یەکێکە لەو مرۆڤانەی دەگمەنن، لە وێنەی ئەو هەرگیز نایەت..».*

## [ ٣ ] خەلاتی سوڵتانیی:

مامۆستا نوورسیی بە بیری تیژی سەرنجی رۆژگاری ئەدا، وە بە فەراسەتی ئیمان‌دار تێ‌گەیی، وا زەنگی مەترسیی لێ ئەدرێ.. ئەورووپای خوانەناس بە لەخۆبایی‌بوونێکەوە خەریکی هەڵلووشینی خۆرهەلاتە، بە تایبەتیی خۆرهەلاتی ئیسلامیی. ئەمرۆ دەستی وا لە کارا و دەسەلاتێکی زۆری هەیە، پێویستە موسڵمانانیش نەخشەیەک بۆ دوارۆژ، بکێشن، تا دەسەلاتی پێویست پەیدا بکەن و بتوانن لە جیهانی ئەمڕۆدا پارێزگاریی بوونی خۆیان بکەن و خۆیان لە توانەوە و تیاچوون دەرباز بکەن.

بۆ ئەمە لە «ئەستەمبووڵ» پێشنیارێکی پێشکەش بە سوڵتان عەبدولحەمید کرد کە تیایا داوای کردنەوەی قوتابخانەی ئەکرد لە کوردستاندا، تا شان بە شانی زانستە ئایینیەکان زانستە تازەکان ـ وێنەی بیرکاریی و فیزیا و کیمیا.. هتد ـ بخوێنرێن، چونکە ئەو ناوچەیە بە تایبەتیی و سەرانسەری جیهانی

ئیسلامیی بەگشتیی، هەژاریی و نەزانیی باڵی ڕەشی بە سەریا کێشاوە.

مامۆستا ویستی سەر لە سوڵتان بدا کەچی ماوەی نەدرا و ناچار چاوی بە نوێنەرەکەی کەوت و دەستی کرد بە ڕەخنەگرتن لە زوڵم و زۆری کاربەدەست و دەست و پێوەندەکانی کۆشکی سوڵتان «کۆشکی یەڵدز»(٤). بەمە دەست و پێوەند ڕقیان لێ هەڵ گرت و دایان بە دادگایەکی سەربازیی.

لە دادگا پیاوانە قسەی کرد، بارودۆخی خستە بەر چاو، سەرۆکی دادگا هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی بی‌داتە دەست لیژنەیەکی نوژداریی نەوەکو شێت بێت. لیژنەکە بریتیی بوو لە نوژدارێکی تورکیی و یەکێ ئەرمەنیی و یەکێ ڕۆمیی و دوانی جوولەکە. بڕیاریان دەرکرد مامۆستا بخرێتە خەستەخانەی «طوب طاش»ی شێتانەوە.

لە خەستەخانە نوژدارێک هاتە سەری بۆ تاقی‌کردنەوەی، خێرا مامۆستا دەستی کرد بە وت‌ووێژ لە گەڵیا و بە شێوەیەکی ناوازە دڵی نوژداری ڕاکێشا و ئەویش ناچار ئەمەی لە سەر ڕاپۆرتەکەی نووسیی:

*« ئەگەر ئەوەندەی گەردیلەیەک شێتیی بە لای «بدیع الزمان»ەوە هەبێ، مانای وایە لە هەموو سەرزەوییدا تاقە ژیرێک نییە ».*

بەمە لەم تۆمەتە ڕزگاری بوو و ناردیان بۆ لای وەزیری ناوخۆ و وەزیر بەخێرهاتنی لێ کرد و ئەم وت‌ووێژە لە نێوانیاندا ڕووی دا:

- سوڵتان سەلامەت لێ ئەکا لەگەڵ هەزار قورش مووچە، کاتێ ئەگەڕێیتەوە بۆ ناوچەکەت مووچەکەت ئەبێت بە سیی لیرە، هەروەها هەشتا لیرەی خەڵاتی سوڵتانیی بۆ ناردووی.

**- هەرگیز داواکاری مووچە نەبووم، وەریشی ناگرم ئەگەرچی هەزار لیرەش بێت، چونکە من بۆ مەبەستی کەسیی خۆم نەهاتووم، بەڵکو بۆ بەرژەوەندیی ناوچەکە هاتووم. ئەوەی ئێوە بۆمی ئەگرن تەنها بەرتیلی بێ‌دەنگ‌بوونە.**

- تۆ بەمە خەڵاتی سوڵتانیی ئەگێڕیتەوە و خەڵاتیشی گێڕانەوەی بۆ نیە.

**- من ئەی‌گێڕمەوە، تا سوڵتان زیز ببێ و بانگم بکا و ئەو کاتە هەلم دەست ئەکەوێ بۆ وتنی ڕاستیی بە لایەوە.**

- سەرەنجام خۆش نابێت.

**- ئەگەر سەرەنجامەکەی خستنمە ناو دەریا بێت، ئەوا دەریاکە بۆم ئەبێتە**

---

(٤) مامۆستا سوڵتانی زۆر خۆش ئەویست، چونکە بە خواناس و وەلیی ئەزانی و بە خەلیفەی موسڵمانانی ئەژمارد، وە ناوی نابوو «السلطان المظلوم - سوڵتانی ستەم‌لێ‌کراو»، ستەم‌لێ‌کراو چ لە لایەن دەست و پێوەندیەوە و چ لە لایەن دوژمنانیەوە.

گۆڕێنکی فراوان و، ئەگەر بدرێم لە سێ‌دارە، ئەوا لە ویژدانی نەتەوەکەمدا نەمرێم. بشزانن کاتێ هاتوومەتە ئەستەمبوڵ گیانم خستۆتە سەر لەپی دەستم، جا هەرچیتان پێ خۆشە، پێم بکەن. من ئەزانم چی ئەڵێم، چونکە ئەمەوێ ملەملاتیانم ئاگادار کەمەوە، ئەمەش بۆ خزمەتی ئەو دەوڵەتەی کە وام لە سایەیا، نەک لە پێناوی بەدەستهێنانی مووچەدا، دوای ئەوە، ئەو خزمەتەی کەسێ وەکو من بتوانێ لەبی‌کات ئەوەیە ئامۆژگاریی پێشکەش بە نەتەوە و بە دەوڵەت بکا، وە ئەم ئامۆژگارییە نرخی نابێت ئەگەر کاریگەریی نەبێت، کاریگەریی چاکیشی نابێت مەگەر کاتێ کە بە دڵسۆزیی بەجێ بهێنرێت و خلتەی تەماعی تیا نەبێت، وە ئەمەش نابێت مەگەر کاتێ کە بە بێ بەرامبەر بێت و دوور بێت لە کەڵکی کەسییەوە، لە بەر ئەوە دەبێ چاوم لێ بپۆشرێ کاتێ ئەم مووچەیە وەر ناگرم.

- گەلاڵە کێشانت بۆ بلاوکردنەوەی زانستەکان لە ناوچەکەتدا ئێستا وا لە ژێر لێ‌کۆڵینەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا.

**- کەواتە بۆچ بلاو کردنەوەی زانستەکان دوا خرا و لە کاری مووچەکەمدا پەلە کرا ؟ وە لە سەر چ بناغەیەک ئەمە بەجێ هێنرا ؟ وە بۆچی کەڵکی کەسیی من پێش کەڵکی گشتیی ئەخەن ؟**

ئەم‌جارەش مامۆستایان جواب کرد، ئەمەش هەر ویستی خوا بوو تا بە پەرۆو پینە خەریکی خزمەتی ئیسلام نەبێت، بەڵکو با دەست لە هەموو لایەنێک بشوات و بە جوانیی بارودخی موسڵمانانی بۆ دەرکەوێ و بە پاکیی ئاور بە لای نووری قورئانا بداتەوە و خزمەتی راستەقینە بکات!

لەم کاتەدا موفتیی میصر مامۆستا بوخەیت‌ی موطیعیی کە زانایەکی ناسراو بوو، سەری لە «ئەستەمبوڵ» دا، داوای لێ کرا بەرابەرکێ لەگەڵ «بدیع الزمان»دا بکا بەشکوم بی‌بەزێنێ. رۆژێکیان یەکیان گرت و موفتیی لە بەر دەم کۆمەڵێ زانادا ئەم پرسیارەی ئاراستەی مامۆستا نوورسیی کرد:

*- لە بارەی ئەو سەربەستییەوە کە لە دەوڵەتی عوثمانییدا هەیە و لە بارەی شارستانیەتی ئەورووپاوە چی ئەڵێی ؟ و رات دەربارەیان چیە ؟*

**- دەوڵەتی عوثمانیی ئێستا ئاوسە بە ئەورووپاوە و رۆژێ ئەبێ دەوڵەتێکی وەک ئەوی بیێ، ئەورووپاش ئاوسە بە ئیسلامەوە و رۆژێ ئەبێ لێی بیێ.**

موفتیی ئەم وەڵامەی زور بە دڵ بوو وتی:

- وام لەگەڵ ئەو رایەدا کە وتی، چونکە منیش هەمان قەناعەتم هەیە و، بەرابەرکێ لەگەڵ گەنجی وادا ناکرێ، چونکە ئەم وەڵامە کورت و کاریگەرە تایبەتە بە «بدیع الزمان»ەوە.

# ڕووداوی سیی‌ویەکی مارت [1]

[ ١ ] بەیەک‌گەیشتن:

مامۆستا تێ‌گەیشت سولتان عەبدولحەمید بە تەنیایە و دەست و پێوەند تەنها بۆ خواردن و ڕابواردن دەوریان لێ داوە، بۆ ئەمە ویستی لە نزیکەوە لە بیروهەستی کۆمەڵەی «إتحاد و ترقي» تێ بگا، ئەوە بوو سەرێکی لە شاری سلانیک دا تا گەورە پیاوانیان بدوێنێ، لە بەر ئەوەی ئەمیش داوای سەربەستیی و شوورای ئیسلامیی دەکرد بەخێرهاتنیان لێ کرد، بەڵام نەیان توانی کەڵک و کۆمەکیی لێ وەر بگرن چونکە هەستی کرد کارێکی ئیسلامییان بە دەستەوە نیە، بۆیە پێی وتن: «بە ڕاستیی دەست‌درێژییتان کردۆتە سەر ئایین و پشتتان لە شەریعەت هەڵ کردووە».

هەر لەوێ سەرۆکی مەحفەلی ماسۆنیی و ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عوثمانیی «عمانۆئیل کاراسّو»[2] داوای چاوپێ‌کەوتنێکی نوورسیی کرد تا بەشکوم کار بکاتە سەری.

چاوپێ‌کەوتن ڕووی دا و بە پەلە خۆی دامالیی و چووە دەرەوە و ئەی‌وت: ئەم پیاوە سەیرە، خەریک بوو بە هێزی وتەکانی بمخاتە ناو ئیسلامەوە.

[ ٢ ] سەربەستیی:

لەو سـەردەمەدا دەنگ و باسی «سەربەستیی» کەوتبووە سەر زمانی خەڵکیی. ئەوە بوو دەوڵەتی عوثمانییش لە ١٩٠٨/٧/٢٣ز دا بڕیاری لە سەر دەستوور و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران دا، مامۆستا سەعیدیش دەستی دایە وتاردان و نووسیین لە ڕۆژنامەکاندا کە موسڵمانان خراپ لە سەربەستیی نەگەن و، ئاگاداری کردن کە چەند دەستێکی گڵاو هەن و هەوڵ ئەدەن ئەم بڕیارە بە دژایەتیی ئیسلام تەواو بێت، پێی وتن:

**« ڕۆڵەکانی نیشتمانەکەم، بە لاریی تەفسیری سەربەستیی مەکەن تا لە**

(١) ڕووداوی سیی‌ویەکی مارتی ساڵی ١٣٢٥ی ڕۆمیی دەکاتە سیانزەی نیسانی ساڵی ١٩٠٨ی ز. ئەم ڕووداوە لە مێژوودا بەو بەروارە ڕۆمییە بەناوبانگە، بۆیە وا ناومان نا، بەڵام بە مێژووی زایینیی باسی دەکەین.

(٢) کاراسّو: یەکەم صەهیۆنیەک بوو هەوڵی ڕووخاندنی دەوڵەتی عوثمانیی دا و هەر ئەویش بوو فەرمانی لابردنی سولتان عەبدولحەمیدی دایە دەستی بە ناوی خەڵکییەوە، سولتانیش زۆری پێ ناخۆش بوو جوولەکەیەکی ماسۆنیی لە کاری وادا دەستی بڕوا و میللەتی داماویش وا بزانێ سەربەستیی دەست دەکەوێ. ئەمڕۆش هەر دەڵێی دوێنێ‌یە.

دەستتان دەر نەچێ، نۆکەریی بۆگەن مەخەنە قاڵبی بریسکەدارەوە و لە زەهرەکەی دەرخواردمان بدەن، سەربەستیی نابەتە دیی و گەشە ناکات بە جێ بەجێ‌کردنی ئەحکامی شەریعەت و پارێزگاریی ڕەوشتەکانی نەبێت ».

ئەوە بوو لە ١٩٠٩/٤/٥ دا کۆمەڵی «اتحاد محمدي» لە «ئەستەمبوول» دروست بوو و لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا لە مزگەوتی «أیــاصوفیــا» بدیع الزمان‌یش وتارێکی قەشەنگی تیا خوێندەوە.

[ ٣ ] بەرپابوونی ئاژاوە:

لەم کاتانەدا کۆمەڵەی «اتحاد و ترقي» دەستیان دایە حوکمی ئاگر و ئاسن و ترس و لەرزیان خستە ولاتەوە. چەندان پیاوی ناوداریان لەناوبرد، میللەتیان بێزار کرد، دوای ئەوە بە فێڵ ئاژاوەیەکیان بەرپا کرد.

(اتحاد)ییەکان لەشکرێکیان لە سلاتیکەوە نارد بۆ «ئەستەمبوول» بۆ پارێزگاریی دەستوور، لە (طاش قشله) مایەوە و سەربازەکان هەڵسان و ئەفسەرەکانیان بەند کرد و لە نیوەشەوی ١٩٠٩/٤/١٣ دا لە گۆڕەپانی سوڵتان ئەحمەدا کۆبوونەوە و لە سەربازگەکانی تریشەوە هەندێ سەربازی تر پاڵیان پێوەدان و بۆ ماوەی یانزە ڕۆژ یاخیی بوون و هەندێ کەسیش تیا چوو. سوڵتان عەبدولحەمیدیش زۆر هاواری لێ کردن بێ هوودە بوو. هەندێ ئاژاوە بەرپا بوو و سەربازەکان هاواریان ئەکرد:

ـ شەریعەتمان ئەوێ.. شەریعەتمان ئەوێ.

بە ڕواڵەت، ئەم ڕووداوە داوای شەریعەت بوو، بەلام لە ژێرەوە دەست‌کیسەی دوژمنانی ئیسلام بوو(٣). تا ئەوە بوو لە ٢٣ی مانگدا سوپای (حرکە) لە سلاتیکەوە بە سەرکردایەتیی «مەحموود شەوکەت پاشا» گەیشتە «ئەستەمبوول» بۆ ئەوەی ئەو یاخیی‌بوونە ساختەیە دامرکێنێتەوە و دەسەلات بگێڕێتەوە بۆ (اتحاد)ییەکان. کە گەیشت دەستی بە سەر بارودۆخا گرت و لە ١٩٠٩/٤/٢٧ دا سوڵتان عەزل کرا و ئەحکامی عورفیی کرایە یاسای ولات و دەست کرا بە حوکم‌دان و لە سێ‌دارەدانی ئەوانەی لەم کارەدا دەستیان بوو..

[ ٤ ] شێری بەردەمی دادگا:

(٣) عەقید ڕەمزی بەگ فەرماندەی ئەم سوپایە بوو کە چوار فەوج بوو. ئەمە یەکێک بوو لە جوولەکەی دۆنمە کە بە دەم موسڵمان‌بوونی دەرخستبوو و لە ژێرەوە ماسۆنیی بوو، لە جیاتی ئەوەی بدرێ بە دادگای عورفیی و سزا بدرێت لە سەر هەڵس‌وکەوتی سەربازەکانی ژێر دەستی، کرا بە سەرۆکی ئەرکانی جەنگ !!

مامۆستا نوورسییش یەکی بوو لەوانەی کە بەرەو سیٚدارە خرانە ڕیٚ. هەرچەندە مامۆستا ئامۆژگاریی سەربازەکانی ئەکرد هیٚمن بن و بگەڕیٚنەوە سەربازگەکانیان و ڕیٚز لە ئەفسەرەکانیان بگرن. بەلاٚم لە ڕاستییدا ئەمە لە سەر ئەو نووسینانەی بوو کە لە ڕۆژنامەی «وولقان ـ گڕکان»دا دژی (اتحاد)ییەکان بلاٚوی ئەکردنەوە.

مامۆستا برایە بەردەم دادگا و دیمەنی لاشەی پانزە کەسی لەسیٚدارەدراو لە پەنجەرەکەوە دیار بوو، خورشید پاشای حاکمی عەسکەریی دەستی کرد بە مەحکەمەکردنی:

ـ تۆیش داوای بەجیٚهیٚنانی فەرمانی شەریعەت ئەکەیت ؟ هەرکەس داوای بکا ئاوا لە سیٚدارە دەدریٚ (دەست بۆ لەسیٚدارەدراوەکان دریٚژ دەکا).

« بدیع الزمان » کە ئەمەی بیســـــت تیٚگەیی حاکم زۆر منالە و نازانیٚ بیروباوەڕی موسلمان چەند پتەوە، بۆیە بە دەنگی مەردانە دای بە گوییٚ دادگادا و وتی:

**« ئەگەر هەزار گیانم هەبیٚ دوودلٚ نیم بیانکەمە قوربانی تاقە ڕاستیەک لە ڕاستیەکانی ئیسلام. وتم من قوتابیی زانیاریم بۆیە هەموو شتیٚ بە ترازووی شەریعەت کیٚشانە ئەکەم. من جگە لە میللەتی ئیسلام دان بە هیچا نانیٚم .. لە بەردەم ئەو بەرزەخەدا کە پییٚ ئەلیٚن (بەندیخانە) ڕاوەستاوم و چاوەڕوانیی ئەو شەمەندەفەرە ئەکەم کە بەرەو قیامەتم ئەبات. وە پیٚتان ئەلیٚم، نەک تا تەنها خۆتان بیبیستن، بەلٚکو با هەموو جیهان دەما و دەمی پیٚ بکا: ئەوا کاتی هاتووە نهیٚنیەکان دەرکەون و لە قوولاٚیی دلاٚ ڕوون ببنەوە، با نامەحرەم سەیریان نەکا:**

**بە تاسەوە ئامادەی بەرەوە قیامەت ڕۆیشتنم و، ئامادەم لەگەلٚ ئەوانەدا بڕۆم کە بە سیٚدارەکانەوە هەلٚواسراون، بیر لەو بیابانئشینە بکەنەوە کە هەوالٚی شوێنە سەیر و جوانەکانی ئەستەمبوولی بیستووە و بە تاسەوەیە بۆیان، من بە تەواوەتیی وەک ئەوم و بە تاسەوەم بۆ قیامەت. دوورخستنەوەمتان بۆ ئەویٚ بە سزا دانانریٚ، ئەگەر ئەتوانن بە سزای ویژدانیی سزام بدەن، ئەم میرییە لە ڕۆژانی زۆرداریدا دژایەتیی لەگەلٚ زیرییدا ئەکرد و ئیستاش دوژمنایەتیی لەگەلٚ ژیاندا ئەکات. جا ئەگەر ئەم میرییە ئاوایە:**

**دە با بژیی هێنیین..**

**دە با بژیی مردن..**

**بۆ ستەمکارانیش با بژیی دۆزەخ..».**

دوای ئەوە دەستی کرد بە هەلٚدانی تاوانەکانی(٤) خۆی کە بە بۆنەیانەوە

ڕاکێشراوەتە بەردەم دادگا:

(یەکەم): ناردنی پەنجاو ئەوەندە برووسکە بۆ پارێزگاکان و عەشیرەتەکانی کوردستان تا پشتگیریی سەربەستیی ڕاستەقینە بکەن.

(دووەم): نزیکەی بیست هەزار دۆستی دڵپاکی بووە لە ئەستەمبووڵدا ئامۆژگاریی کردوون تا دژی دەوڵەت نەوەستن و بە کەس دەستخەرۆ نەبن.

(سێیەم): ئەورووپا هەوڵ ئەدا بێخاتە دڵی خەڵکییەوە کە ئیسلام مایەی زۆرداریی و ستەمە، ئەمیش بە پشتگیریی دەستوور و یاسا ویستوویەتی پێچەوانەکەی بسەلمێنێ.

(چوارەم): پەرچی بێڕەوشتیی خاوەن ڕۆژنامەکانی داوەتەوە، ئەوانەی لایەنگیریی ماسۆنییەت و ئیلحاد ئەکەن، چونکە ڕۆشنبیری خاکی ئیسلام ئەبێ ڕەوشتبەرز بێ.

(پێنجەم): پاڵ دانی بە کۆمەڵەی «اتحاد محمدي»ەوە دوای تاقیکردنەوەی ئەو پیاوانەی بەرپایان کردووە. کە بە ڕاستیی هەوڵدانە بۆ بەرزیی ئیسلام.

(شەشەم): پارێزگاکانی کوردستان دواکەوتووبوون و پێویستییان بە زانست هەبوو، مامۆستاش ـ وەک لە پێشەوە بە کورتە باس کرا ـ هەوڵێکی زۆری دا تا زانکۆیەکی ئیسلامیی تیا بکرێتەوە، جا لە جیاتی ئەمە چەند پووڵ و پارەیەکیان بۆ نارد و کە ئەمیش وەری نەگرت بە تاوان بۆی ژمێررا.

بە ڕاستیی پیاوانە هاتە گوفتار.. بە وێنەی شەپۆلێکی تیژ لە دادگادا دەنگی هەڵ بڕی.. ئەو بووە حاکم و دەستەی دادگایش بوونە کۆمەڵێکی تاوانبار لە بەر دەستیا.. سام و هەیبەتی ئەو ناوەی داگیر کرد بوو.. ڕاستیی وشەکانی پەردەی دڵانیانی لا دا بوو، هەموو سەرسام بوون لە بەردەم شێری بێ وێنەدا..

ئەم وتارەی مامۆستا کە بە گیانێکی فرە بەرزەوە لە بەردەم کۆڕی دادگادا دای، ڕۆژنامەکان بە پەلە بڵاویان کردەوە کە لە دە لاپەڕەی گەورە زیاتر بوو، خێرا خەڵکێکی زۆر لە دەوری دادگا کۆبوونەوە و ئەیان قیراند:

دە با بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران.. دە با بژی مردن بۆ ئاژاوەچیان.

سەرەنجام مامۆستا نوورسیی ئازاد بوو و دوای کەمێک لە ساڵی ١٩١٠ دا «ئەستەمبووڵی» بە جێ هێشت و بەرەو «وان» گەڕایەوە. لەوێ دەستی کرد بە گەڕان بە سەر هۆز و عەشیرەتەکاندا تا ڕێگای ڕاستیان پیشان بدا. وە پەڕاوی

---

(٤) واتە: تاوان بە ڕوانگەی دادگا، کە لە ڕاستیبدا کار و ڕەوشتی ڕەنگینی مامۆستا بوون کە شانازییان پێوە دەکرێ.

«مناظرات» و «محاكمات»ی دانا كە لەوەو دوا لە «ئەستەمبووڵ» لە ساڵی ١٩١٣ دا چاپ كران.

## [ ٥ ] گەشتی شام:

لە زستانی ساڵی ١٩١١ دا سەری لە شامدا كە خوشكی لەویٚ بوو، لە مزگەوتی ئومەوییدا لە دیمەشق بە زمانی عەرەبیی وتارێكی دا و ڕووی كردە زانایان و كۆمەڵێكی گەورەی نوێژكەران، تیایا نەخۆشیی موسڵمانان و چارەسەرییەكانی باس كرد، ئەم وتارە لە نامیلكەیەكی تایبەتییدا لە ژێر ناونیشانی «الخطبة الشامية» دا چاپ كراوە.

لە دیمەشقەوە ڕۆیشت بۆ «بەیرووت» و لەوێشەوە بە ڕێگای دەریادا بۆ «ئەستەمبووڵ» تا جارێكی تر هەوڵ بدا لەگەڵ سوڵتان «محمد رشاد» دا بۆ دامەزراندنی «زانكۆی زەهرا». چاوی بە سوڵتان كەوت و لە گەڵیا ڕۆیشت بۆ گەشتی «روملي».

سوڵتان و كۆمەڵەی «اتحاد و ترقي» بەڵێنیان پیٚ دا زانكۆیەكی ئیسلامیی لە خۆرهەڵاتا بكاتەوە تەنانەت ئەو مەبلغەیش پێویست بوو[5] دیاریی كرا و بەردی بناغەیش لە سەر ڕۆخی دەریاچەی «وان» دانرا، بەڵام ئەوەندەی پیٚ نەچوو جەنگی جیهانیی یەكەم هاتە بەرەوە و تەفرەی دا.

---

(٥) ئەو پارەیە نۆزدە هەزار لیرەی زێڕی عوثمانیی بووە.

# سەربەرزیی ئیماندار

[ ١ ] جەنگی جیهانی یەکەم:

مامۆستا نوورسیی لە قوتابیەکانی و موسڵمانانی تر چەند تیپێکی بۆ جیهاد پێک هێنا و دەستیان کرد بە مەشق بۆ فێربوونی جەنگ، جا رووی کردە قوتابیەکانی و وتی:

**« خۆتان ئامادە بکەن.. بووملەرزەیەکی توند خەریکە روو بدات ».**

قوتابیەکانی بە نیشانەپێک و ئازایەتیی و چاونەترسیی ناویانگیان دەر کردبوو، بۆیە ئەو ئەرمەنییانەی کە بووبوونە کۆمەکی سوپای رووس زۆر لێیان ئەترسان، چونکە ئەمان بە ڕاستیی ئامادەی شەهیدیی بوون.

مامۆستا یاسایەکی جوان و ڕێک‌وپێکی بۆ قوتابیەکانی دانا بوو، لە لایەکەوە خەریکی خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان و وانەخوێندن ئەبوون، لە لایەکی ترەوە خۆیان لە سەر کوشتار ڕائەهێنا و شەوان یا پاسەوانییان ئەکرد، یا هێرشیان ئەبردە سەر دوژمنان.

قورئان بە دەستێکەوە و چەکیش بە دەستێکەوە، تا موسڵمان پارێزگاریی بیروهەست و بوون و قەوارەی خۆی و موسڵمانان بکات و هێرشی نیازخراپان پەرچ بداتەوە.

جەنگی جیهانیی یەکەم ـ وەک نەگبەتییەک ڕوو بکاتە ئادەمیزاد ـ هەڵ گیرسا، بەرەی قەفقاسیش بەش بە حاڵی خۆی جەنگی ناهەموار و خوێناویی تیا رووی دا، ڕووسیا هەوڵی ئەدا بەرەو ئەنادۆڵ بکشێ، لەشکرەکەشی سێ قاتی لەشکری عوثمانییەکان بوو بۆیە توانیی لە ١٩١٦/٢/١٦ دا بڕژێتە ناو شاری (ارضروم)ەوە.

خواناسەکان خەریکی کوشتاری لەشکری کافری دەستدرێژیی‌کەر بوون، مەردانە ئەچوون بە گژ دوژمناندا، مامۆستاش لەم جەنگە ناهەموارەدا پەڕاوی «اشارات الاعجاز في مظان الايجاز»ی بە زمانی عەرەبیی دانا کە ئەو ئەی‌وت و (مەلا حەبیب)ی قوتابیشی بۆی ئەنووسیی، و بەینا و بەینیش خۆی بە کوردیی بۆی لێک ئەدانەوە..

بەڵێ، بە ڕۆژا جەنگ و بە گژاچوونی کافری دەستدرێژیی‌کەر و بە شەوا و لە کاتی پشوودان دا ـ کە سەربازانی تر پەنایان ئەبردە بەر حسانەوە ـ ئەم

پەنای ئەبردە بەر قورئانی پیرۆز، تا حەسانەوەی ڕاستەقینەی دەست کەویْ و پەنجە بۆ ئەو نهێنیانەی کە بیری تیژی ئەوی پیْ گەیشتووە درێژ کا.

کــافـران ئەیانەویْ بــە ماددیی و مەعنەویی موســـڵمانان و بیروباوەڕیان بتوێننەوە، جا ئەگەر موسڵمانانی تر ـ بەوپەڕی غیرەتەوە ـ بیانەویْ بە ڕۆژا بەر پەرچی هێرشی ماددییان بدەنەوە، مامۆستا ئەیەویْ زیاد لەوە بە شەوا و لە کاتی پشوودا ـ بەڵکو لە سەر پشتی ئەسپەکەی و لە ناو سەنگەرەکەیا ـ بە مەعنەوییش ـ بە دەرخستنی گەورەیی و بیْوێنەیی قورئان ـ بەرپەرچیان بداتەوە، تا ورەی ئیمانداران بەرز بێتەوە و بەرپەرچی ماددییان ئەگەر کەمێک بخایێنیْ، بەردەوامییان لە سەر بیروباوەڕ هەمیشەیی بێت.

وا مامۆستا خۆی هەندیْ لە بیرەوەریەکانی ئەم جەنگە ناهەموارە لە «پاشکۆی ئەمیرداغ» دا ئەگێڕێتەوە:

**« لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لەگەڵ شــەهید مەلا حەبیبدا خۆمان ئامادەی هێرش ئەکرد بۆ سەر ڕووسەکان لە بەرەی پاسینلەردا.. تۆپخانەی ڕووسیی بەرێژەی سیْ گوللەتۆپی لە هەموو دەقیقەیەک وە یا دوو دەقیقەدا تیْ ئەگرتین، سیْ گوللە لە سەر سەرمانەوە بە بەرزیی نزیکەی دوو مەتر تەقینەوە.. سەربازەکانمان کە لە دوامانەوە لە سەنگەرەکاندا خۆیان شاردبۆوە دەستیان دایە کشانەوە. بۆ تاقی کردنەوە بە مەلا حەبیبم وت: چی ئەڵێیت مەلا حەبیب ؟ لەو لەعنەتیانە خۆم ناشارمەوە. پیْی وتم: منیش دەستبەردارت نابم و ناکشێمەوە.**

**گوللەی دووەمی تۆپەکە لە نزیکمانا کەوتە زەویی.**

**بە مەلا حەبیبم وت و متمانەشم بە چاودێریی خوایی بۆمان هەبوو:**

**هەستە با بۆ پێشەوە بڕۆین ! گوللەی ئەوانە ناتوانیْ بمانکوژیْ.. هەرگیز بەرەو هەڵدێری تێک شکان و کشانەوە بۆ دواوە ناڕۆین ».**

[ ٢ ] کردەوەی موسڵمانانە:

مامۆستا بیستی وا سوپای ڕووسیی بەرەو «وان» ئەکشیْ و بڕیار دراوە شار لە دانیشتوان چۆڵ بکریْ. تا لە سەربڕینی چاوەڕوانکراوی ڕووسیی ڕزگاریان کەن. جا لەگەڵ قوتابیەکانیا بڕیاریان دا قەڵای شار چۆڵ نەکەن و بەرگریی لیْ بکەن تا شەهیدبوونی دواکەسیان، بەڵام لایەنی سەربازیی بڕیاری کشانەوەی دا بۆ شاری «گەواش».

کاتیْ دانیشتوان شاری «وان»یان بەجیْ ئەهێشت، سوارانی قازاقی ڕووســیی هەڵەتیان ئەدانیْ و مامۆســـتا و قوتابیەکانیشــی بەرگرییان لە

دانیشتوان ئەکرد و تووشی ماندووبوون و ئازارێکی زۆر بوون و زۆریٚ لە قوتابیەکانی شەهید بوون، بە تایبەتیی مەلا حەبیب.
لە یەکیٚ لەو جەنگانەدا خۆیان بە شکاو نواند و کشانە دواوە و پێشەنگی سوپای ڕووسیی بەرەو پێشەوە هات، تا ئەوە بوو دوژمن گەیشتە ناوچەی دەشتاییەوە کە لە هەموو لاوە چیا دەوریان دا بوو، ئەوسا هەڵ گەڕانەوە و دەوریان دان و تاقیان لیٚ بڕین.
جارێکیان سوپای ڕووس دەستی بە سـەر سـێی تۆپی سوپای تورکیی تێک‌شکاودا گرت. مامۆستا «بدیع الزمان» قوتابیی و پێشمەرگەکانی کۆ کردەوە و پێی وتن:
**« کیٚ لە گەڵا دێت بۆ ڕزگارکردنی ئەو تۆپانە لە دەستی ڕووس !!».**
سیٚ‌صەد کەس بڕیاریان دا بچن لە گەڵیا. لە هێرشێکی شەوانەدا لە دەستیان سەندنەوە و مامۆستا خۆی و سیٚ قوتابیی یەکیٚ لەو تۆپانەیان ڕا ئەکێشا.
لەم کاتەدا ئەرمەنیەکان دابوویانە پاڵ ڕووس بە هیوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی بۆیان دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوثمانیی، ئەمانە هێرشیان ئەکردە سەر گوندە موسڵمانەکانی ناوچەی «وان» و چییان دەست کەوتایە، هەتا منالیش، ئەیان کوشت. موسڵمانەکانیش هەروا ئەگەر ئەرمەنییان بە دیل بگرتایە ئەیان‌کوشتن.
جارێکیان هەزارەها منالی ئەرمەنیی کەوتە دەست موسڵمانەکان و مامۆستا نوورسیی لەو ناوچەیەدا بوو، خێرا قەدەغەی سەربازە عوثمانییەکانی لە کوشتنیان کرد و فەرمانی دا بەر بدرێن و بنێررێنەوە بۆ ناو سوپای ڕووسیی تا بگەنەوە لای کەس و کاریان.
ئەم کردەوە جوانەی مامۆستا نوورسیی کارێکی گەورەی کردە سەر سەرۆکە ئەرمەنیەکان، بۆیە دوای داگیرکردنی چەند گوندێکی موسڵمان لە لایەن ڕووسەوە سەرکردە ئەرمەنیەکان وازیان لەو کارە ناشیرینەیان هێنا و منالانی ئەو دیٚ‌هاتانەیان سەر نەبڕیی. بەمە مامۆستا بووە هۆی ڕزگاربوونی هەزاران منالیٚ بیٚ‌تاوانی هەردوو لا لە سەربڕین..

### [ ٣ ] چۆڵ‌کردنی شاری «بەدلیس»:
سوپای ڕووسیی تا ئەهات زیاتر ئەهاتە ناو خاکی ئیسلامەوە بۆ ویران کردنی شار و گوندی موسڵمانان، تا ئەوە بوو نزیک شاری «بەدلیس» کەوتەوە

و دەوڵەتی عوثمانییش بڕیاری چۆڵکردنی فەرمانگەکانی دا و خەڵکییش خۆیان بۆ بەجێهێشتنی شار ئامادە کرد..
بە بەرزایی سێ چوارە مەتر بەفر باریی بوو، پیاوان هەرچی دەستیان چەکی بگرتایە لە سەنگەرەکانیانا پاسەوانییان ئەکرد. ئافرەت و منداڵ و پیرەکانیش کەوتنە ڕێ، بەو سەهۆڵ بەندانە کەوتنە بەجێهێشتنی خانوو و بەرەو سامان و داراییان.. هەر ئەوەندە نەکەوتنایەتە ژێر دەستی ڕووسی کافرەوە ئیتر هیچیان نەئەویست. ئەو خێزانانەی شەش حەوت منداڵیان هەبوو یەک دوانێکیان نەبێ هەموویان بەجێ ئەهێشتن. بە هەژاریی و داماویی کۆرپەی جگەرگۆشە بە چ حاڵێک بەخێو کرا بن، وا کەسوکاریان لە سەرە ڕێگادا و لە ژێر پردەکاندا بە جێیان دێڵن.. کۆرپەکان فرمێسکیان ئەڕێژا و دایکانیش بە دەنگی گریە و شیوەن چەم و دۆڵیان پڕ کرد بوو.. تا لە چاو گوم ئەبوون جگەرگۆشەکان بە دوای کەس و کارا ئەیان ڕوانی و ئەوانیش بە هەناسە هەڵکێشانەوە ئاوڕیان ئەدایەوە و بە زۆرە ملێ و بە برسێتیی ڕێگای پڕ لە سەهۆڵیان بە هەزار زەحمەت ئەبڕی..
هەوڵ و تەقالا و بیروهەســتی خوانەناسیی هاتە بەر و مرۆڤایەتیی ئێش و ژانێکی زۆری چەشت..
ســوپای خوانەناسیی ڕژایە ناو شار و گوندی موسڵمانانەوە. خەریک بوو بەرە بەرە شــەو دا ئەهات بە ســەر موســڵمانانا.. بەرەو کزیی و لاوازیی ئەڕۆیشتن.. بۆیە کافران چاویان بڕی بووە خاک و ئاویان..
جەنگێکی خویناویی لە نێوان سوپای فرە و فراوانی ڕووس و موسڵمانە بەغیرەتەکانی دەوری مامۆستا نوورسییدا ڕووی دا.. کۆڵان و شەقامەکانی شار پڕ بوون لە لاشە و خوێن.
دەســتەیەک شــەهید و بەرەو بەهەشــت و، دەســتەیەکیش ســتەمکار و دەستدرێژیی‌کەر و بەرەو دۆزەخ، کەوتنە ڕێ..
لەشکری ڕووس لە چاو هێزە بچکۆلەکەی موسڵمانەکانا دەریا بوو.. هەموو کەرەسەیەکی جەنگی ئەو ڕۆژەی بە دەستەوە بوو، ئەمانیش تەنها تفەنگ و حەربەیان پێ بوو و بەس.

[ ٤ ] لە بەردەم سێدارەدا:
مامۆستا لەم جەنگەدا بریندار بوو و پێی شکا و لەگەڵ قوتابیەکیا کەوتە گۆمە ئاوێکی بەستووەوە لە ژێر کەوانەی ئاوی یەکێ لەو بینا گەورانەوە کە

دوژمن داگیری کردبوو.. بەردەوام خوێنی لێ ئەڕژێشت.. بۆ ماوەی سێی سەعات لە سەر خۆی چوو، قوتابییەکەی ترسی لێ نیشت لە ژیانی مامۆستا. ناچار هەواڵی بە سەربازە ڕووسییەکان دا، هاتن و مامۆستایان بە دیل گرت، سەرکردە ڕووسییەکە ڕێزێکی زۆری لێ گرت و چارەسەریی شکاویی پێیان کرد تا بەشکوم دڵی نەرم بێت و کەڵکی لێ وەر گرن.

سەرکردە ڕووسییەکە پێی وت:

- تۆ سەرکردەیەکی ناسراویت، بۆیە من وای بە چاک ئەزانم نامە بنووسی بۆ عەشرەتە کوردەکان و بانگیان بکەیت بۆ بەدەستەوەدانی چەکەکانیان، ئەو کاتە ئەتوانین لە یەک بگەین و ڕێکەوتن‌نامەیەک بنووسین و بەو پێیە لەم زەویانە بکشێینە دواوە و بۆتانیان بە جێ بێڵین.

**- بەڵکو من وای بە چاک ئەزانم ئێوە هەڵسن بە کۆکردنەوەی چەک لە ئەرمەنییەکان، جا کە هاتنەوە ژێر سایەمان ئەوا ئەو کاتە ئەتوانین لە یەک بگەین.**

سەرکردە ڕووسیەکە ئەم وەڵامەی مامۆستای بە دڵ نەبوو، بۆیە وتی:

- نزیکەی (٣٥) هەزار ئەرمەنیی چەک‌دار لە ناوچەی «بەدلیس» و«مووش»دا هەن و، کۆکردنەوەی چەکەکانیان نەگونجاوە.

**- لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە ئەو هەموو سەربەستییەمان دا بە ئەرمەن، ئەوان ئەم هەموو کارەساتە ناهەموارانەیان هێنا بە سەرمانا. کە دەستیان دایە سەربڕینێکی گشتیی ، هەتا مناڵانیش لێی ڕزگار نەبوون ، ئێوە ئێستا بە فڕۆکەکانتان ئەتانەوێ پاشماوەی دانیشتوان، بە هۆی ئەو ئەرمەنیانەوە لە ناو بەرن . منیش پێت ئەڵێم: ئەگەر بە سەربازەکانت ئەم شاخ و دەشت و چەمانە پڕکەیت، ئەوا ناتوانیت لە دەربەند «دلک طاش» تێپەڕ کەیت.**

سەرکردە ڕووسییەکە دەستی لەوە شۆریی کە مامۆستا «بدیع الزمان» کۆمەکییان بکات بۆیە لەگەڵ دیلەکانی ترا ناردی بۆ ئۆردووگای دیلەکان لە «کۆسترمە» لە باکووری خۆرهەڵاتی ڕووسیا.

ڕۆژێکیان «نیکۆلا نیکۆلا ڤیچ»ی خاڵۆی قەیسەر و سەرکردەی گشتیی بەرەی ڕووسیی سەرێکی لە ئۆردووگای دیلەکان دا، هەموویان لە بەری هەڵسان جگە لە مامۆستا نوورسیی.

نیکۆلا هەستی پێ کرد، بۆیە جارێکی تر هاتەوە بە بەردەمیا، ئەمجارەش هەڵ نەسا، بۆ جاری سێیەم لە بەردەمیا وەستا تاتێ بگا هۆی ڕێزلێنەگرتنی چیە، بۆیە تەرجومانێکی هێنا و لە ڕێی ئەوەوە لە مامۆستای پرسی:

ـ وا دیارە نامناسی !
**ـ بەڵێ.. ئەتناسم، تۆ نیکۆلا نیکۆلا ڤیچ ی خاڵۆی قەیسەر و سەرکردەی گشتیی بەرەی قەفقاسی.**
ـ کەواتە بۆچ بە سووک سەیرم ئەکەی ؟
**ـ نەء، من بە سووکیی سەیری هیچکەس ناکەم، بەڵکو کارێکم ئەنجام داوە کە بیروباوەڕەکەم فەرمانم پێ ئەدا.**
ـ بیروباوەڕەکەت چ فەرمانێکت بە سەرا ئەدا..
**ـ من زانایەکی موسڵمانم، دووتوێی دڵم ئیمانی تیایە. ئەو کەسەش ئیمان لە دڵیایە چاکترە لەو کەسەی ئیمانی نیە، جا ئەگەر من لە بەرت هەڵسامایە ئەوا ڕێزی کەمم بۆ بیروباوەڕ و موقەددەســـاتم دا دەنـا ، لـــە بەر ئەوە لە بەرت هەڵنەسام.**
ـ کەواتە هەر بەوەی سیفەتی بێئیمانییت بڕی بە سەرما، ئەوا خۆم و سوپاکەم و نەتەوەکەم و قەیسەرت بە سووکیی سەیر کردووە. بۆیە پێویستە دادگایەکی سەربازیی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کارەت ئەنجام بدرێ.
مامۆستا تاوانبار کرا و درا بە دادگا. جا چونکە خاوەنی ڕێزێکی زۆر بوو بە لای دیلەکانەوە، ماتەمینیی باڵی بە سەر ئۆردووگاکەدا کێشا، بۆیە ئەو ئەفسەرە تورکیی و ئەڵمانیی و نەمساوییانەی کە لە گەڵیا دیل بوون لێی پاڕانەوە داوای چاوپۆشیی لە سەرکردە بکا. بەڵام ئەم ئەو ڕایەی پەسەند نەکرد و دایە دواوە و پێی وتن:
**« من دڵم پێوەیە کۆچ بکەم بۆ قیامەت و بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەم، بۆ ئەمە من تەنها پێویستییم بە بلیتی سەفەر هەیە بۆ قیامەت، وە من ناتوانم کارێ بکەم پێچەوانەی ئیمانەکەم بێت ».**
مامۆستا کۆڵی نەدا و دادگاش ویستی هێزی خۆی تاقی بکاتەوە.. فەرمانی لەسێدارەدانی دەرکرد. ڕۆژی جێبەجێکردن هاتە بەرەوە.. کۆمەڵێ سەرباز بە سەروکاریی ئەفسەرێکی ڕووسیی ئامادە بوون تا موسڵمانی خواناس بەرنە مەیدانی لەسێدارەدان و بیکەنە ئامۆژگاریی بۆ کەسانی تر. فریشتەکانی ئاسمانیش خۆزگەیان ئەخواست بۆ ئەو هەنگاوە بەرز و پیرۆزە و بە چاوێکی ڕێزەوە سەیریان دەکرد.
مامۆستا لە ئەفسەرەکە هاتە پێشەوە و بەوپەڕی خۆشیی و شادمانییەوە پێی وت:
**ـ داوات لێ دەکەم کەمێ ماوەم بدەی تا دوایین ئەرکی سەرشانم بە جێ بێنم..**

هەڵسا و دەستنوێژێکی گرت و دوو ڕکات نوێژی بەجێ هێنا.

با هەموو دروستکراوانی خوا شاهێد بن، وا خواناسێک لە بەر هێزی ئیمان و قووڵیی بیروباوەڕ لە بەردەم سێدارەدا بە سەربەرزییەوە وەستاوە و بە زمانی حاڵ دەڵێ:

**بێباوەڕان، سەنگی باڵە مێشوولەیەکتان بۆ دانانێم.. تازە بڕیارم داوە تەنها بۆ پەروەردگارم مڵکەچ کەم و سەردانەوێنم.. بڕیارە و داومە و تا مردن ـ خوا کۆمەک بێت ـ کۆڵ نادەم.**

خاڵۆی قەیسەر خۆیشی ئامادەی ئەنجامی لەسێدارەدان بوو، کە ئەم هەڵوێستەی بینی و چاوی لە مامۆستای ئیماندارەوە بوو لەبەردەم پەروەردگاریا وەستا، لێی هاتە پێشەوە و وتی:

*ـ داوای لێبووردنت لێ دەکەم[1]. وا هات بە بیرما بەو کارەت مەبەستت سووکەسەیرکردنی من بوو، بەڵام ئێستا دڵنیام تەنها کاریٚ ئەنجام ئەدەی کە بیروباوەڕ و ئیمانەکەت فەرمانت بە سەرا ئەدا، بۆیە وا بڕیاری دادگام بەتاڵ کردەوە و پیرۆزباییت لێ ئەکەم بۆ دامەزراوییت لە سەر بیروباوەڕەکەت و جارێکی تریش داوای لێبووردنت لێ ئەکەم.*

## [ ٥ ] شەوانی دیلیی و تەنیایی:

مامۆستا نوورسیی بۆ ماوەی دوو ساڵ و چوار مانگ و چوار ڕۆژ بە دیلیی مایەوە، کە لەو ماوەدا خەریکی پێشکەشکردنی وانەی ئیمانیی بوو بە ئەفسەرە دیلەکانی تر کە نەوەد ئەفسەر بوون، تا ئەوە بوو شۆڕشی بەلشەفیی ڕووی دا و ئاژاوە و پشێویی ڕووی کردە ولات و ئەمیش بە یارمەتیی و کۆمەکیی پەروەردگار توانیی ڕابکات و بگاتە ئەڵمانیا کە لەویٚ پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا، و لەوێیشەوە بەرەو «ئەستەمبووڵ» گەڕایەوە.

جا وا مامۆستا خۆی بیرەوەریی ڕۆژانی دیلیی لەم چەند دێڕەدا ئەگێڕێتەوە:

**« لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە شارێکی زۆر دووری باکووری خۆرهەڵاتی ڕووسیادا، کە پێی ئەوترا «کۆسترمە» دیل بووم. لەو شارەدا، لە سەر کەناری ڕووباری «ڤۆلگا»ی بەناوبانگ مزگەوتێکی تەتارەکان هەبوو. لە نێو ئەفسەرە دیلەکانی هاوەڵدا دڵتەنگ بووم، بۆیە حەزم لە گۆشەگیریی بوو،**

---

(١) داوای لێبووردن لە کوێ و لەسێدارەدان لە کوێ ؟! هەر کەسێ لەگەڵ خوادا ڕاست کات و خوای گەورەی بە ڕاستیی خۆش بوێت، ئەوا ئەبێتە خۆشەویستی خوا و بە ئاسمان و زەویدا جاڕ دەدرێ تا هەموو دروستکراوان خۆشیان بوێت و ڕێزی لێ بگرن.

بەڵام ڕێم نەئەدرا بە بێ ئیزن هات و چۆی دەرەوە بکەم، دوای ئەوە بە زامنیی و کەفالەتی دانیشتوانی گەڕەکی تەتارەکان ڕێم درا لەو مزگەوتەدا بێنمەوە. ئیتر بە تەنیا تیایا ئەخەوتم.. بەهار نزیک کەوتەوە و شەوگاری ئەو ناوچە دوورەش زۆر درێژ بوو.. لە زوربەی ئەو شەوە تاریکانەدا کە بە چارشێوی ڕەشی غەریبیی خۆیان پێچابوو، تووشی خەوزڕان ئەبووم، کەوا جگە لە خوڕەی خەمباری ڕووباری «ڤۆلگا» و چرکەی ناسکی تکەی باران و هەنسکی جیایی و غەریبیی و گڤەی با هیچی تر نەئەبیسترا. ئەمانە بەس بوون تا لە خەوی قورسی بێ ئاگایی بێدارم کەنەوە. وە هەر چەندە هێشتا خۆم بە پیر نەدەزانی، بەڵام هەر کەسێ جەنگی جیهانیی بدیبایە دەبوا پیر ببوایە، چونکە چەند ڕۆژێکی وەها تێپەڕین کە منداڵیان تیا پیر دەبوو، هەروەک یەکێ لە ڕازە نهێنیەکانی ئایەتی ﴿يوماً يجعل الولدان شيباً﴾(المزمل: ١٧) چوویێتە ناویانەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە نزیکی چل ساڵیی بووم کەچی خۆمم وا ئەهاتە بەر چاو کە وام لە تەمەنی هەشتاساڵییدا.

لەو شەوە تاریک و درێژ و خەمناکانەدا و، لەو دەوروبەرەی پڕ لە خەفەتی غەریبیە و، لەو واقیعە پڕ ئێش و ئازارەدا، نائومێدییەکی قورس بەرامبەر ژیان و نیشتمانم چۆکی دایە سەر سنگم. جا هەرچی ئاوڕم بە لای بێ دەسەڵاتیی و تەنیایی خۆمەوە دەدایەوە هیوام ئەبڕا. بەڵام لە قورئانی پیرۆزەوە کۆمەکییم بۆ هات و زمانم ئایەتی: ﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾ی دووپات ئەکردەوە و دڵیشم بە گریانەوە ئەیوت : غەریبم .. لاوازم .. بێ دەسەڵاتم.. ئەمان ئەخوازم .. داوای چاوپۆشیی ئەکەم .. دادی کۆمەکییمە ، لە درگای ڕەحمەتتدا ئەی پەروەردگارم[2]. بەڵام ڕۆحم کە خۆشەویستانی زووی شارەکەمی کەوتەوە یاد و مردنی لەم غەریبییەدا هاتە پێش چاو شیعرەکانی «نیازیی میصریی»[3] دەخوێندەوە کە لە دووری هاوڕێ دەگەڕێ:

« بە لای هەموو خەفەتێکی دونیادا گوزەرم کرد و دامە شەقەی باڵ بەرەو (عدم)

---

(٢) لە پاڵ ئەم هەموو ئێش و ئازارەدا مامۆستا موسڵمانەکانی لە یاد نەئەچوو، هێشتا دەست*بەرداری بەشداریی جەنگ نەئەبوو، بۆیە بە نهێنیی پەیوەندیی بە ئەنوەر پاشاوە ئەکرد و هەواڵی دایە کەوا خەریکە دەوڵەتی قەیسەر ئەڕووخێ و شۆڕشی لە دژ بەرپا ئەبێ. یەکەم کەسێ کە ئەم هەستە بکا مامۆستا نوورسیی بوو و کاربەدەستانی ئەستەمبووڵیش بە هیچ شێوەیەک بڕوایان نەئەکرد.

(٣) شاعیرێکی صۆفییە (١٦١٨-١٦٩٤م) لە زانکۆی ئەزهەر خوێندوویە، بۆیە نازناوی میصریی لێ نراوە.



مامۆستا نوورسیی دوای خوڵهاتنی له دیلیی ڕووسەکان گەیشتە ئەڵمانیا و لەوێ کاربەدەستان ئەم وێنەیەیان گرن.

Offener Befehl

Nr. 63

ОТКРИТЬ ЛИСТЪ

N°

آچيق امر

نومرو ٦٣

........ számú

Nyilt parancs

für Herrn / за Господинъ: Said Mirza — سعيد ميرزا افندى — úr részére

[illegible]

Служебенъ чинъ

Truppenteil / Csapattest / Отъ коя войсково часть: Kurd [illegible]

Staatsangehörigkeit / Honosság / Поданство: Osmanli

Reist von / Utazik / Патува отъ: Sofia — صوفيه

nach / за: istanbul — درسعادت

Zweck der Reise / Az utazás célja / Причини на пътуването: [illegible]

Dieser Ausweis – offene Befehl – ist nur gültig im Zuzammenhang mit ——

........ ausgestellt von ........

ئیجازەی گەڕانەوەی «بدیع الزمان»

لەئەسارەتەوە بۆ وولات.

ناو: سعید میرزا ئەفەندی

پلە: یاریدەدەری سەرۆک

هێز: تیپی جانفیداکارانی کورد.

شوێنی دەرچوون: سۆفیا.

شوێنی بۆچوون: ئەستەمبوڵ

هۆی سەفەرکردن: گەڕانەوەلە ئەسارەت.

١٧/حەزیزان/١٣٣٤رومی (١٩١٨ زاینی)

به تاسەوە دەفڕیم و
لە هەموو ساتێکدا هاوارم دەکرد:
هاوڕێ..
هاوڕێ..»!

بە هەر حاڵ.. «بێدەسەلاتیی» و «لاوازیی»م لەو شەوە خەمناک و درێژ و تێکەڵ بە تەنیایی و دڵناسکیی و غەریبییەدا بوونە هۆی نزیک کەوتنەوەم لە خوای پاک و بێگەرد و بوونە تکاکار و نزاکەر لە دەرگانەی خوا، بە شێوەیەک تا ئێستایش سەرسامی ئەوەم کە چۆن توانیم - دوای چەند رۆژێکی کەم - ڕا بکەم و بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ماوەیەک ببڕم کە مەگەر بە ساڵێکی تەواو بە پێ ببڕرێت و لەگەڵ ئەوەشا زۆر شارەزای زمانی ڕووسیی نەبووم. وە بە شێوەیەکی سەیر و سەرسوڕهێنەر، بە فەزڵی چاودێریی خوایی، کە بە بۆنەی بێدەسەلاتیی و لاوازییمەوە هات بە فریامەوە، لە دیلیی ڕزگارم بوو و بە «وارشۆ» و «ڤیەننا» دا گەیشتمەوە «ئەستەمبووڵ». بەم جۆرە لەو دیلییە ڕزگارم بوو بە شێوەیەک لە بەر ئاسانیی جێی سەرسوڕمان بوو، کەوا گەشتی درێژی ڕاکردنم بەوپەڕی ئاسانیی تەواو کرد، بە جۆرێ کە ئازاترین و زیرەکترین و لێزانترین کەسێ کە شـــــارەزای زمانی ڕووســـــیی بێت نەیدەتوانی تەواوی بکا ».

# ژیانی پایتەخت

[ ١ ] ئەندامی «دار الحكمة»:

مامۆستا ـ بە کۆمەکیی خوا ـ لە دیلیی ڕزگارینی بوو و گەیشتەوە «ئەستەمبووڵ».. ڕێزێکی زۆری لێ گیرا و لە لایەن خەلیفە و فەرمانڕەوای گشتیی و قوتابیانی زانستە شەرعییەکانەوە پێشوازییەکی گەورەی لێ کرا. جا چونکە شارەزاییەکی چاکی هەبوو لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ بێ ئەوەی خۆی ئاگادار بێ لە ١٩١٨/٨/١٣ دا هەڵ بژێرا بە ئەندامی «دار الحكمة الاسلامية»[1] کە ئەم پایەیە بە زانا بەرزەکان نەبوایە بە کەسی تر نەئەدرا.

مامۆستا نوورسیی تازە گەڕابۆوە و پێویستیی بە پشوودان بوو دوای چەشتنی ماندوێتیی و زەحمەتی ڕۆژانی دیلیی، بۆیە نەی‌ئەتوانی ئامادەی کۆبوونەوەکانی «دار الحكمة» ببێت، لە ئەنجاما داواکارییەکی نووسی تا ئەو کارە لە سەر شانی لابەرن.

لە کاتی ئەندامێتییدا دەوڵەت مووچەی بۆ بڕی‌بۆوە بەڵام کەمێکی نەبێ کە پێی بژی هیچی بۆ خۆی گل نەئەدایەوە، ئەوی تری ئەدا بە چاپی نامیلکەکانی و لە ڕێی خوادا بڵاوی ئەکردنەوە..

لەم کاتەدا عەبدوڕڕەحمانی برازای لە گەڵیا بوو. هەوڵی ئەدا پارە پاشەکەوت بکا کەچی مامەی دەی‌نارد بە دوای بەڕێوەبەری چاپخانەیەکدا تا نامیلکەی بۆ چاپ کات بە پارە پاشەکەوتەکەی لای عەبدوڕڕەحمان. ئەمیش کە داخی لێ ئەهات و بە چ حاڵێ لە دەمی خۆیانی گرتبۆوە، دڵخۆشیی خۆی بەوە ئەدایەوە کە نامیلکەکان دوای فرۆشتن پارەکەیان دێتەوە مشتی. کەچی دوای چەند ڕۆژێ تر ئەی‌نێرێ بە دوای بەڕێوەبەری چاپخانەکەدا تا پێی بڵێ لە سەر نامیلکەکان بنووسێت: «بە خۆڕایی دابەش دەکرێن بە سەر موسڵماناندا».

بەم کارەی مامەی زۆر پەست بوو و وەک ئەی‌گێڕێتەوە، هەستی بە کەم بوونەوەی پەیوەندیی گیانیی نێوانیان دەکرد، بۆیە دەســتی کرد بە گریان و پێی‌وت: مامە گیان! هەندێ پارەم پاشەکەوت کرد بوو بۆ چاک‌کردنەوەی خانووەکەمان کە جەنگ ڕووخاندبووی، وا ئێستا ئەو هیوایەمت بڕیی.. جا ئەمە دەگونجێت؟

---

(١) گەورەترین کۆڕ و دەستەی زانیاریی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوثمانیی بووە و چەندین زانا و شاعیری بەرز تیایدا ئەندام بوون.



مامۆستا نوورسیی و عبدالرحمنی برازای له دوای جەنگی جیهانی یەکەم له ئەستەمبوول.

مامۆستا پێ کەنی و وتی:

**- کوڕەکەم، عەبدورڕەحمان گیان ! دەوڵەت مووچەیەکی زۆری ئەدا پێمان، بەڵام من بۆم نیە هیچی لێ وەرگرم جگە لە پێویستیی، جا هەرچی لەوە زیاد بوو پێویستە بگێڕرێتەوە بۆ «بیت المال»، بۆیە منیش زیادەکانم بۆ موسڵمانان گێڕایەوە.**

دوای ئەوە دڵخۆشیی دایەوە کە هەر کاتێ خوای گەورە بیەوێ خانووی پێ ئەبەخشێ.

لەم کاتەدا ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازیی زیاتر ڕووی ئەکردە دەوڵەتی عوثمانیی، شکان و دۆڕان ئاوڕیان بە لایدا دابۆوە، سوپای دەوڵەتە داگیرکەرەکان ڕژایە تورکیاوە و پەیمانی «سیڤەر» یان بەست بە کۆلیا.. کافران ڕۆژیانە، وا موسڵمانان خەوتوون و خوێندەوارەکانیش مێشکیان لە زانستێ پڕە کە خزمەتی دوژمنان بکات.. ڕۆژیانە وا ئەنیشنە مل خاکی ئیسلام و کەسێ نیە ڕاویان بنێ، بۆیە مامۆستا نوورسیی هەستی بە ئازاری جگەری ئەکرد هەروەک خەنجەر لە دوای خەنجەری بەر کەوتبێ.

ئەوەتا خۆی لە بارەی ئەم ماوەیەی ژیانیەوە ئەنووسێ:

**«کە لە دیلیی گەڕامەوە، لەگەڵ عەبدورڕەحمانی برازاما لە سەر لووتکەی «چاملجە»ی «ئەستەمبووڵ» لە خانوویەکی گەورەدا نیشتەجێ بوو بووم، ئەتوانرێ ئەو جۆرە ژیانەی کە منی تیا ئەژیام - لە لایەنی دونیاییەوە و بە گوێرەی ئێمەمانان - بە ژیانێکی میسالیی دابنرێ.. چونکە لە دیلیی ڕزگار بوو بووم و، دەرگاکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی «دار الحكمة الاسلامية» بە گوێرەی پیشە و ئەرکی زانستیی سەرشانم لێم خرابوونە سەر پشت. شۆرەت و ناوبانگ و بە پیرەوە هاتن بە ڕادەیەک دەوریان دابووم شایستەیان نەبووم. دانیشتووی «چاملجە»ی جوانترین شوێنی ئەستەمبووڵ بووم و، هەموو شتێک بە ویستی دڵم بوو. چونکە خوا لێ خۆش بوو عەبدوڕڕحمانی برازامم لە گەڵدا بوو کە لەوپەڕی زیرەکیی و چالاکییدا بـــوو ، لـــە هەمان کاتا قوتابیی و خۆبەختکەر و خزمەتگوزار و نووسەرم بوو، هەتا بە کوڕێکی مەعنەویی خۆمم دەژمارد.**

**لەم کاتەدا کە خۆمم بە بەختیارترین کەسی ئەم جیهانە دەزانی، سەیرێکی ئاوێنەم کرد، چەند تاڵە موویەکی سپیم لە سەر و ڕیشمدا بە دی کرد، و ئەو بێداربوونەوە ڕۆحییەی کە لە دیلییدا لە مزگەوتەکەی کۆسترما هەستم پێ کرد سەری هەڵ دایەوە. ئیتر دەستم کردە سەرنجدان و بیرکردنەوە بە وردیی لەو**

شتانەی کە دڵم وابەستەیان بوو و وام دەزانی ئەوانە خولگەی بەختەوەریی دونیایین، جا هەر شتێک و هۆیەک بە وردیی سەرنجم دا بێ، بۆم دەر کەوتووە: هۆیەکی بێ‌نرخ و خەڵەتێنەرە و شایستەی وابەستەیی و پەیوەندیی پێوە بوون نیە، سەرەڕای ئەوەش لەو کاتەدا کەم‌وەفایی، بەڵکو بێ‌وەفایی، وە بە شێوەیەکی چاوەڕوان‌نەکراو و بە خیالاً نەهاتوو، لە هاوەڵێکی دڵسۆزمەوە دەرکەوت کە لە بەوەفاترین هاوەڵم ئەژمێررا. ئەمانە هەموویان بوونە هۆی دوورکەوتنەوە و نەفرین‌کردنم لە ژیانی دونیا و، لە دڵی خۆمم پرسی:

ئایا بە تەواوەتیی خەڵەتاوم کە دەبینم زۆربەی خەڵک بە چاوی حەسوودییەوە سەیری ئەم ژیانەی ئێمە ئەکەن کە لە ڕاستیدا شایستەی شیوەن و گریانە؟..
ئایا ئەو هەموو خەڵکە شێت بوون یان من بەرەو شێتی دەڕۆم کە ئەو دونیاپەرستانە بە شێت ئەزانم؟ بە هەرحاڵ ئەم بێداربوونەوەیە کە بە دیتنی پیرییەوە ڕووی دا، فێری کردم و زۆر چاک تێی گەیاندم کە: ئەو شتانەی وان لە نەمان و تیاچوونا ئەبێ هەر بڕۆن و نەمێننەوە !!

دوای ئەوە ئاوڕم بە لای دەروونمدا دایەوە و بینیم لەوپەڕی بێ‌دەسەڵاتییدایە، ئیتر ڕۆحم کە داخوازیی مانەوە و نەمریی ئەکرد و دەستی بە دامێنی دونیا و ئەو شتانەی ڕوو لە نەمانن گیر کرد بوو کە وای ئەزانی نەمریی و مانەوە لەوانەدایە، ئەم ڕۆحەم هاواری کرد:

*( من کە لاشەکەم فانیی بێت، بە تەمای چ سوودێکم لەو شتە (فاني)یانە؟ من کە بێ‌دەسەڵات بم، چاوەڕوانیی چی بکەم لەو بێ‌دەسەڵاتانە؟ ئیتر ئەم دەردەم دەرمانی نیە لای ئەو خوایە نەبێ کە بەدەسەڵاتە و هەمیشەییە و هەر بووە و هەر ئەبێ ).*

**ئیتر دەستم دایە گەڕان و پشکنین».**

## [ ۲ ] ئالای ژێرپێ‌کەوتوو:

ئەوە بوو سەرەنجام دەوڵەتی عوثمانیی دۆڕا و لە هەشتی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۸ زدا دەوڵەتی «اتحاد»ییەکان کەوت و لە سیی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۹ز دا چەند مەرجێکی ڕەق و نالەبار بە کوڵی دەوڵەتی عوثمانییدا بەستران تا زیاتر دەستەوسان بکرێت و ملکەچی کافران بێت، سەرۆکانی کۆمەڵەی « اتحاد وترقي »یش بە بێ ئابڕوو ، کە داوای یەکسانیی و سەربەستییان ئەکرد، وڵاتیان بەجێ هێشت و ڕایان کردە دەرەوە.

لە شانزەی مارتی ساڵی ١٩٢٠ ز دا سوپای ئینگلیز، بە یارمەتیی قوتابیە ئەڵقەلەگوێکانی ئەوروپا، شاری ئەستەمبوولی داگیر کرد .. کافران ڕژانە پایتەختی ئیسلامەوە. هەتا موسڵمانەکان شوێنکەوتەی قورئان بوون و بە دوای سوڵتان «محمد فاتح»ەوە بوون، ئەستەمبوولیان ڕزگار کرد و کردیانە قەڵای ئیسلام، بەڵام کە بەچکەکانیان خۆیان فرۆشت و بوونە پاشخوانخۆری داگیرکەران پایتەختیان دایە دەست دوژمن.

لە کاتێکا کە لەشکری دوژمنان ڕژایە ئەستەمبوولەوە کەمایەتیە ناموسڵمانەکانی خاکی ئیسلام دەستیان دایە چەپڵە و ئاهەنگ.. ئەوپەڕی نامەردیی بوو لێیان وەشایەوە، بەرامبەر بە مەردایەتیی و پیاوچاکیی موسڵمانان کە چەندە ڕێز و سەربەستییان پێشکەش ئەکردن..

کافر هەمیشە نامەردە و لەگەڵ موسڵمانا هەرگیز پاکیی نەبووە، بەڵام موسڵمانی چاکویست هەمیشە کاری مەرد و جوامێرانەی لێ وەشاوەتەوە.

جوولەکە و ئەرمەن بە شەبقەکانیان بەخێرهاتنیان لە سوپای کافران دەکرد و چەپڵەیان بۆ لێ ئەدان و گوڵبارانیان ئەکردن، بەڵام ڕۆم ئاڵای یۆنانیی بچووکیان بە دەستەوە گرتبوو و هاواریان ئەکرد: «زیتۆ.. زیتۆ» واتە: بژی.. بژی.

جەنەراڵ فرانزدوپێری سەرکردەی فەرەنسییش سواری ئەسپێکی سپی بوو بوو و بە شەقامی بەگئوغلۆدا بەرەو باڵیۆزخانەی فەرەنسیی لاسایی پیاوە داگیرکەرە گەورەکانی ئەکردەوە و دەستی بۆ خەڵکەکە بەرز ئەکردەوە و بێشەرمانە بە ئەسپەکەیەوە نیشتە مل ئاڵای عوثمانیی و شێلای.

موسڵمانانیش بە دڵێکی زامدارەوە سەیری ئەم دیمەنە جەرگ بڕەیان ئەکرد..

بە بەستنی پەیمانی سیڤەر مامۆستا زۆر خەمبار بوو، هەر وەک شیر و تیر بە جەرگیا بکرێت.. ئێش و ئازارێکی زۆری پێگەیشت و بە ڕادەیەک وەک تەعزیەبار دۆستانی دڵخۆشییان ئەدایەوە تا ئازاری دڵی کەم بێتەوە، ئەویش لە وەڵاما ئەیوت:

**« من ئەتوانم هەموو ئێش و ئازاری کەسیی خۆم هەڵ گرم، بەڵام ئێش و ئازاری نەتەوەی ئیسلام هاڕیمی، من وا هەست ئەکەم چی تیر و ڕم گیراوەتە جیهانی ئیسلامیی، یەکەمجار لە دڵی من گیراوە، بۆیە ئەمبینن دڵشکاوم، بەڵام نوورێک ئەبینم ـ ان شاء الله ـ ئەم ئازارانەمان لە یاد ئەباتەوە ».**

[٣] پیلانی ئینگلیز:

مامۆستا ئازارێکی زۆری پێگەیشت، بۆیە پەڕاوی «خطوات ست»ی دانا و بەنهێنیی بە ناو قوتابیەکانیا بلاوی کردەوە کە تیایا هێرشی ئەکردە سەر ئینگلیز و پیلانە گلاوەکەی ئاشکرا ئەکرد کە چۆن نەخشە کێشراوە بۆ لەناوبردنی موسڵمانەکان.

داگیرکەران شەش پاگاندەیان بلاوکردبۆوە تا وورەی موسڵمانەکان نەهێڵن و بە ئاسانیی بتوانن بە سەریانا زاڵ بن.

ئەو پاگاندانە زۆر بە فێڵبازانە ڕێک خرا بوون. مامۆستاش بەوپەڕی دانایەتییەوە وەلامی ئەدانەوە:

*پاگاندەی یەکەم:* ئەیانوت: ئێوەی موسڵمان ئەڵێن ئێمە شانمان هەڵ ئەگرێ ئەم بەلاو نەگبەتییەمان بە سەرا هاتووە، جا کەوایە دەی ڕازیی بن بە داگیرکردنی ولات و ژێرچەپۆکبوونتان.

مامۆستاش ڕوونی ئەکردەوە:

بەڵێ، ئێمە تاوانبارین و لە فەرمانەکانی خوا یاخیی بووین بۆیە وا بەلامان بە سەرا ڕژاوە و، ڕازیی بوون بە فەرمانی خواییش بریتیە لە تەوبە و پەشیمانیی لە گوناهـ و تاوان تا بەلاکە لاچێ و ڕەحمەتی خوا بباریٚ. چونکە بەلا و لێقەومان یاخیی دا ئەچڵەکێنێ نەک هۆیەک بێت بۆ بەردەوامیی زوڵم.

بەڵێ، هەر کاتێ خەڵکیی لێی قەوما و ناڕەحەت بوو، خێرا ئەڵقە لە گوێکانی کافر پاگاندە ئەکەن: بۆچی خوا نایەت بە هاوارمانەوە ؟! بۆچی نزامان گیرا نابێت ؟!

پێویستە ئیمانداران ئاگایان لە خۆیان بێت:

(یەکەم): خوای گەورە ستەم لە کەس ناکات و هەر کۆمەڵێک یاخیی ببێت سزای ئەدا، هەر موسڵمانێکیش دامەزراو بێت پاداشتی نافەوتێ.

(دووەم): موسڵمان بە مەرجی حەسانەوەی ئەم ژیانە خواپەرستیی ناکات، بەڵکو ڕازیی دەبێت سەراسەری ژیانی زەحمەت و مەینەت بێ بەو مەرجەی لە فەرمانی خوا یاخیی نەبێت.

(سێیەم): لە خواپاڕانەوە بۆ لابردنی بەلا، بۆ ئەوە نیە کە تەنها بەلاکە لاچێت، بەڵکو ماوەی ئەو بەلایە هەلێکی چاکە بۆ خواپەرستیەکی تایبەتیی کە بریتیە لە پاڕانەوە و خۆدان بە دەست خواوە بە تەواوبوونی، تەواو ئەبێت.

*پاگاندەی دووەم:* موسڵمانەکان ! ئێوە لە گەڵ کافری ترا ـ وەک ئەڵمانیا ـ ڕێک کەوتوون، دەی لەگەڵ ئێمەشا ڕێک کەون.

مامۆستا وەڵامی ئەدانەوە بەوەی کە:

موسڵمانان دەستی یارمەتیی و دەستی دوژمنایەتیی بە یەک چاو تەماشا ناکەن. چونکە هەموو ســـیفەتێکی کافر کافر نیـــە و موســـڵمان بۆی هەیە پەیوەندیی لەگەڵ کافرا ببەستێ بۆ خزمەتی ئیسلام، بەڵام شوێن کەوتن، نا.

*پاگاندەی سێیەم:* کاربەدەستانی خاکی ئیسلام توانایان نیە بە چاکیی کاروبارتان هەڵسووڕێنن و ستەمتان لێ ئەکەن، جا ئێمە با سەروکاریتان بکەین. چونکە خۆتان تواناتان نیە و لێی نازانن..

مامۆستاش ڕوونی کردەوە کە:

هۆی بنەڕەتیی هەموو ئاژاوە و تاوانێکی کاربەدەستانی خاکی ئیسلام ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیروهەستە مادییەی کە فەلسەفەی خورئاوایی بردوویەتیە مێشکی بەناو ڕۆشنبیرەکانەوە و بە خۆیان نازانن و بۆ ماددە وازیان لە دین لە ئیسلامەوە. جا تا موسڵمانان شوێن‌کەوتەی کافران بن زیاتر ئەڕووخێن و زیاتر ناچاری ژێرچەپۆکییان ئەبن.

*پاگاندەی چوارەم:* بە ناو موسڵمانەکانا بڵاویان ئەکردەوە کە ئەوانەی دژی داگیرکەران وەستاون نیازیان بێ‌کەڵکە و لە مەبەست و نیازی ئیسلامییەوە دوورە. ئەمەش بۆ دروست‌کردنی ناکۆکیی.

مامۆستا نموونەیەک دێنێتەوە بۆ ئەوەی دەم‌کوتیان بکات و موسڵمانانیش تەسک بیین نەبن و فێر بن هەروا بە ئاسانیی هەموو ڕێگایەک، لە خۆیانەوە، لە خۆیان نەگرن. چونکە ئەوانە (هۆ، وسیلە)ن و، کاریگەریی نیازیش لە سەر هۆ کەمە...

بۆ نموونە: ئەگەر بمەوێ زەوییەک هەڵکەنم بۆ دەرهێنانی ئاو و کەسێکی تر یارمەتیی هەڵکەندنی دام بە نییەتی خۆشاردنەوە، کە گەیشتە ئاستی دەرهاتنی ئاو، نییەتی ئەو، ئاوەکە ناباتە دواوە. چونکە شەرت هەڵکەندنەکەیە نەک مەبەستەکەی.

*پاگاندەی پێنجەم:* لـە بەر ئەوەی پێشـەوا دڵـی وا پێوە لـەگەڵ کافرانا ڕێک‌کەوێ دەی با موسڵمانەکانیش گوێڕایەڵیی فەرمانی بکەن.

بە تێگەیشتنی ئیسلامیی مامۆستا ڕوونی کردەوە کە:

پێشەوا کاتێ گوێڕایەڵیی بۆ ئەکرێ لە ئیسلام لا نەدات و بەرژەوەندیی موسڵمانان نەخاتە ژێر پێی.

*پاگاندەی شەشەم:* داگیرکەر وای بڵاو ئەکردەوە خۆی بە هێزە و موسڵمانان خۆیان ماندوو ئەکەن هەر هەوڵێ بدەن بۆ خۆڕزگارکردن، چونکە توانای بەرەنگارییان نیە و یەکجار لاوازن.

مامۆستاش بە وردبینیی موسڵمانێکی هوشیارەوە ڕوونی کردەوە:

هێزی گەورەی دیاری دوژمنان لە سەر جووتە پێی لەرزۆکی فێڵ و خەڵەناندن و گومڕاکردن وەستاوە، جا ئێمەی موسڵمان هەرگیز دەست بەرداری بەرەنگاریی نابین لە بەر سێ هۆ:

یەکەم: فێڵ و گومڕاکردن کاتێ کار ئەکەن پەردەی نەزانیی و بێئاگاییان بە سەرا کێشرا بێ. خۆ ئەگەر موسڵمانان بەخەبەر هاتن و لە ناوکرۆکی کوفر و بێڕەوشتیی گەیشتن، ئەوا مەردانە دەست بە ڕێبازی ڕزگارییەوە ئەگرن و باکیان لە هێزی داگیرکەر نیە.

دووەم: هێزی دوژمنمان بێبەرامبەر نیە و بە بۆنەی بەربەرەکانێی نێوان خۆیانەوە . ۹۰٪ ی هێزی لە دەست ئەدات و بۆیە دەوڵەتێ ئێستا بەهێز بێ هەروا نامێنێتەوە. وەک ئینگلیز کە بووە لاوازترین دەوڵەت لە چاو سەرەتای صەدەی نۆزدەدا و لە هەموو وڵاتەکاندا دەرکرا و دەسەڵاتی نەما(۱).

سێیەم: ئەگەر لە هەردوو کاتا ـ بە دەستگرتن بە ئیسلامەوە و بەوازهێنان لێی ـ هەر مردن بەشمان بێ، جا بۆچ بە مەردانە نەمرین ؟ ژیانی مل‌کەچیی و زەلیلیی چ کەڵکێکی هەیە ؟

کەواتە هەوڵدان بۆ پاک‌کردنەوەی وڵات لە داگیرکەران و بیروهەستی گلاویان مایەی سەربەرزیی دنیا و قیامەتە.

یەکێ تر لەو پیلانانەی کە دوژمنان دژی ئیسلام نەخشەیان ئەکێشا ئەوە بوو لە ڕێگای کلێسەی (انگلیکان)ەوە ئینگلیز شەش پرسیاریان لە «مشیەخەی ئیسلامیی» کرد تا بە شەش‌صەد وشە وەڵامیان بدرێتەوە. ئەم پرسیارانە ڕەوانەی مامۆستا «بدیع الزمان» کران، ئەویش وەڵامی دایەوە:

**« ئەم پرسیارانە بە شەش‌صەد وشە وەڵام نادرێنەوە، بە شەشیش نا، یەک وشەیش نا، بەڵکو بە یەک تف بکرێتە ناوچاوی بێشەرمی ئینگلیزەوە ».**

مامۆستا بە چاوی خۆی ناپاکیی دەرەوە و ناوەوەی جیهانی ئیسلامیی ئەبینی کە دژی ئیسلام ئەکرا، دەوڵەتی عوثمانیی ڕووخا و پارچە پارچە کرا، کافرانی سەرزەویی دەستیان بە سەر دڵیانا هێنا و ماتەمینییش سەرانسەری خاکی ئیسلامی داپۆشیی بوو(۲).

---

(۱) ئەوەتا لەم دواییەشا یەکێتیی سۆڤییەت ئابڕووی هەموو یەکێتیی‌یەکی ڕووکەشی برد و بە ماوەیەکی کەم هەڵوەشایەوە!

(۲) مامۆستا سێ ساڵ لە ئەستەمبووڵ مایەوە دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ «وان». سەیری ئومێدی سیانزەهەمی «پەیامی پیران» بکە تا لە یەکێ لە تابلۆ گرنگەکانی ژیانی شارەزا ببی کە بریتیە لە گەڕانەوەی بۆ «وان» و دیتنی شارەکەی بە سووتاویی و قوتابخانەکەی بە ڕووخاویی و نەهاتنە گوێی جریوەی بولبولانی قوتابخانەکەی کە نزیکەی بیست ساڵ تیایا وانەی وتۆتەوە، ئینجا سەرنجی چارەسەریی ئەم هەڵویستە لە ڕێگای ئیمانەوە بدە !!

[ ٤ ] بەرهەڵستیی داگیرکەران:

مامۆستا زۆر دژی داگیرکەران بوو، ئەوانەی کە وڵاتی ئیسلامیان پارچە پارچە کرد و هەوڵیان ئەدا دەنگ و ڕەنگی ئیسلامیی تیا کپ کەنەوە.

ئەوە بوو بزووتنەوەی بەرهەڵستکردنی داگیرکەران لە ئەنادۆڵدا سەری هەڵ دا، ئینگلیزیش بە زۆر «شیخ الاسلام» عەبدوڵلا ئەفەندییان ناچار کرد فەتوا دژی ئەو بزووتنەوەیە دەربکا، ئەوە بوو خێرا حەفتا و شەش موفتیی و سیی و شەش زانا و یانزە نوێنەر پێکەوە دژ بەو فەتوایە فەتوایەکیان دەرکرد و موسڵمانانیان هەڵ ئەنا دژی داگیرکەران، کە مامۆستا سەعید نوورسییش یەکێ بوو لەو زانایانە کە نووسیی:

**« فەتوایەک لە مەشیخە و بەڕێوەبەرایەتیەکەوە دەرچێ کە لە ژێر فەرمانی ئینگلیزا بێ، هەر ئەبێ نادروست بێ و، نابێ گوێڕایەڵیی بۆ بکرێ. چونکە ئەوانەی بەرگریی ئەکەن و دژی داگیرکەران وەستاون، ناگونجێ بە یاخیی بوو بدرێنە قەڵەم، بۆیە پێویستە ئەو فەتوایە بکێشرێتە دواوە ».**

ناوبانگی دژایەتیی مامۆستا بۆ داگیرکەران دەرچوو.. ئەوە بوو بانگیان کرد بۆ ئەنقەرەی بنکەی بزووتنەوەکە تا پاڵیان پێوە بدات. بەڵام مامۆستا ئەم بانگ کردنەی دایە دواوە و وتی:

**« من ئەمەوێ لە ترسناکترین شوێندا جیهاد بکەم، نەک لە پشت سەنگەرەوە، من وا ئەبینم کە ئەم شوێنەم پڕمەترسییترە لە (ئەنادۆڵ) ».**

چەند جارێکی تر بانگیان کردەوە.. ئەمجارە لە جیاتی خۆی هەندێ لە قوتابییەکانی نارد بۆ «ئەنقەرە»، دوای ئەوە خۆیشی لە ١٩٢٢ دا کەمێ پێش جەژنی قوربان چوو بۆ ئەوێ و، بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕ کرا..

بەڵام لەوێ دڵی نەکرایەوە، چونکە کاربەدەستانی بەبێ ئایین کەوتە بەرچاو و بەوپەڕی داخەوە سەرنجی دا زۆربەی نوێنەرەکان هەتا نوێژیش ناکەن. هەڵس وکەوتی موصطەفا کەمال و ڕەوشـــتی لار و چەوتی دژ بـــە ئیسلام زۆر خەفەتباری کرد.. لە پایتەختی ئیسلامدا کاربەدەستان دژی ئایین بن، ئەبێ کێ دژی دوژمنان بوەستێ ؟ لە دەوڵەتی ئیسلامییدا شەریعەت بخرێتە پشت گوێ، ئەبێ کێ بەرگریی لە خاکی ئیسلام بکات ؟ بۆ ئەمە لە ١٩٢٣/١/١٩ دا بڕیاری لەچاپدانی بەیانێکی دا بریتیی بوو لە دە ماددە و ئاراستەی نوێنەرەکانی کرد کە تیایا ئامۆژگاریی ئەکردن و ئیسلامی بیر ئەخستنەوە و ترسی ڕۆژی زیندووبوونەوەی ئەخســـتە دڵیانەوە کە بەم ڕســـتەیە دەســـتی پێ ئەکرد:

« اعلموا ايها المبعوثون، انكم (لمبعوثون ليوم عظيم)».

بەیانەکە لە لایەن سەرکردەی یەکەمی بزووتنەوەی سەربەخۆیی جەنەڕاڵ کاظم قەرەبەکرەوە خوێنرایەوە و نزیکەی شەصت لە نوێنەرەکان تۆبەیان کرد و دەستیان کردەوە بە نوێژ، بە ڕادەیەک ژووری نوێژکردنی ئەو ئەنجوومەنە بەشی نوێژکەرانی نەئەکرد و گواستیانەوە بۆ ژوورێکی گەورەتر.

موصطەفا کەمال ئەم بەیانەی بە دڵ نەبوو، بۆیە مامۆستای بانگ کرد و گفتوگۆیەکی توندوتیژ بەم شێوەیە لە نێوانیاندا ڕووی دا:

- بێگومان ئێمە پێویستییمان بە مامۆستایەکی لێهاتووی وەک جەنابت هەیە، ئێمە بانگمان کردیت بۆ ئێرە بۆ کەڵک وەرگرتن لە بیروڕا گرنگەکانت، بەڵام یەکەم کارت باسی نوێژ بوو، یەکەم هەوڵێکیشتان لێرەدا نانەوەی ناکۆکیی بوو لە نێوان کۆمەڵی ئەم ئەنجومەنەدا.

- (بە توندیی پەنجەی بەرز کردەوە) **پاشا.. پاشا.. گەورەترین ڕاستییەک دوای ئیمان پرشنگ بداتەوە نوێژە، ئەو کەسەش نوێژ نەکا ناپاکە و حوکمی ناپاکیش ڕەتکراوەیە.**

پاشا سەرنجی دا ئەم پیاوە بۆ ئەو و نەخشە گڵاوەکانی دەست نادات و لە سەر بیروهەستی خۆی بۆ کەس دانابەزێ، بۆیە ویستی لە «ئەنقەرە» دووری بخاتەوە بە بیانووی دامەزراندنی بە ئامۆژگاری گشتیی بۆ پارێزگاکانی خۆرهەڵات بە مووچەیەکی دڵڕفێن، یاوەکو بیگێڕێتەوە بۆ ئەندامێتیی «دار الحكمة الاسلامية» و پێش‌کەش کردنی خانوویەکی گەورە بۆی، بەڵام مامۆستا بەو فێڵانە نەخەڵەتاو بە گوێی نەکرد..

# مردن ولەدایکبوون

[ ١ ] سێ نوور:

ماوەی هەشت مانگێک مامۆستا لە «ئەنقەرە» مایەوە، لەو ماوەیەدا چاوی لێ بوو دانیشتوان چ خۆشەویستیەکیان بۆ ئیسلام هەیە، بە تایبەتیی کاتی تێکشکانی یۆنان لە بەردەم سوپای ئیسلامدا، بەڵام لە پاڵ ئەم خۆشیی و شادییەدا هەستی بە دەستێکی گڵاو کرد کە بێئیمانیی بڵاو دەکردەوە و کۆمەڵی موسڵمانی ئەڕووخاند، بۆیە دەستی دایە نووسینی چەند نامیلکەیەک لە بارەی تەنیایی خوا و بڕوا بە قیامەت تا ببنە بەربەستێک لە بەردەم بیری خوانەناسییدا.

دوای ئەوەی بە چاکیی لە نیازی بەدخوازی زوربەی کاربەدەستان، بە تایبەت نوێنەرەکان، تێگەیشت کە چۆن قوڵی دژایەتیی ئیسلام و موسڵمانانیان لێ هەڵ مالیوە، تووشی ئەندێشەیەکی زۆر بوو.. ئەهاتە پێش چاوی سەرانسەری جیهانی ئیسلامیی بەرەو چ نەگبەتییەک ڕا ئەکێشرێ.. چ فێڵ و پیلانێک بۆ قەلاچۆکردنی ئیمان لە سەرزەویدا نەخشە کێشراوە.

تێ گەیشت گورگ و ڕێویی سەریان کردۆتە جیهانی ئیسلامیی و دۆستی تێگەیشتوویشی کەمە.. ئەمیش بە تەنیا و بە کۆمەکیی قوتابیەکانی چی بکا لەو لافاوە بێویژدانە، وای بە چاک زانیی خواپەرستیی و لاڵە و پاڕانەوەی لە دەرگانەی پەروەردگارا زۆر بکا و شەوان بە خواپەرستیی بە سەر بەرێ تا بەشکوم خوای گەورە بە سۆز و ڕەحمەتی خۆی دەرمانی ئەم دەردە ناهەموارە بنێرێ، بۆ ئەمە لە ساڵی ١٩٢٣ دا بەرەو «وان» گەڕایەوە و لە کەلاوە کۆنەیەکی سەر کێوی «ئەرەک» دەستی دایە خواپەرستیی و گۆشەگیریی بۆ پەروەردەی ڕۆح و دەروونی.

لە کاتی گەڕانەوەیا بۆ «وان»، لە ڕێگای «بطوم»ەوە، بە لای شاری «تەفلیس» دا[(١)] تێ پەڕیی، سەرکەوتە سەر پۆپەی گردی «صەنعان» و بە هەر چوارلادا چاوی ئەگێڕا. ئا لەم کاتەدا پۆلیسێکی ڕووسیی هات و لێی پرسیی:

---

(١) شارێک بووە لە شارەکانی دەوڵەتی عوثمانیی و ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی ڕووسدا بووە، پاشان بە پەیمان‌نامەیەک لە نێوان تورکیا و ڕووسیادا درا بە ڕووسیا.

- بۆچی وا بەم شێوەیە چاو بە هەموو لایەکدا دەگێڕیی ؟
- **نەخشەی قوتابخانەکەم دەکێشم.**
- تۆ خەڵکی کوێیت ؟
- **خەڵکی بەدلیسم.**
- بەلام ئێرە تەفلیسە.
- **بەدلیس و تەفلیس بران.**
- مەبەستت چیە ؟
- **سێ نوور لە ئاسیا و جیهانی ئیسلامدا هەن یەک لە دوای یەک دەر ئەکەون، سێ تاریکاییش یەک لە سەر یەک داتان ئەپۆشن و پەردەی ئەم ستەم و زۆردارییە ئەدڕێ و دێتەوە یەک، منیش بە دەوری خۆم دێم تا لێرەدا قوتابخانەکەم بنیات بنێم.**
- ئای کە سەرسامم لەم ئاواتەت !.
- **بەڵکو ئای کە سەرسامم لە ژیرییت. ئایا بە لاتەوە گونجاوە ئەم زستانە نەبڕێتەوە ؟ هەموو زستانێک ئەبێت بەهارێکی بە دوادا بێت و، هەموو شەوێک ڕۆژێکی بە دوادا بێت.**
- جیهانی ئیسلام بە خراپترین شێوە پارچەپارچە بووە.
- **بەڵکو ڕۆیشتوون بۆ وەرگرتنی زانیاریی. ئەوەتا هیند کوڕێکی ئامادەی ئیسلامە، لە قوتابخانەی ئامادەیی ئینگلیزدا هەوڵ و کۆشش ئەکا و، میصر ڕۆڵەیەکی زیرەکیەتی لە قوتابخانەی ئیداریی ئینگلیزدا ئەخوێنێ و، قەفقاس و تورکستان دوو کوڕی پاڵەوانن و لە قوتابخانەی جەنگیی ڕووسیبدا مەشق دەکەن... هتد.**

**جا ئەو ڕۆڵە بەوەفا نەجیبانە دوای وەرگرتنی بڕوانامەکانیان هەر یەکەیان حوکمی کیشوەرێک ئەگرێتە ئەستۆ و، ئالای ئیسلامی دادپەروەری مەزنی باوکیان بەرز ئەکەنەوە تا بەرز بەرز لە سەر لووتکەی ڕەوشتبەرزییدا بشەکێتەوە و، ئەو نهێنیی دانایە ئەزەلییەی، کە لە فیترەی مرۆڤایەتییدا ڕیشکی داکوتاوە، لە بەردەم شایەتەکانی قەدەری ئەزەلیی خواوەندا، بە کوێرایی چاوی ڕۆژگار، ڕادەگەیەنن(٢).**

(٢) لە خوا بە زیاد بێ وا پێشبینیی‌یە ئیمانی‌یەکەی مامۆستا نوورسیی هاتەدی؛ ئەوەتا دوای هەرەس‌هێنان و توانەوەی شێرە بەفرینەکەی سۆڤیەت گەلانی موسڵمانی ئەوێش پشوویان هاتەوەبەر و کەوتنە چالاکیی ئیسلامیی و ئیمانیی خۆیان. یەکێ لەو چالاکییانە ئەوە بوو کە لە مانگی حوزەیرانی ئەم ساڵی ١٩٩٢دا لە هەموو شارە مەزنەکانی وەک: بوخارا و سەمەرقەند و طەشقەند و شارەکانی ئازەربایجان چەندین قوتابخانەی نوور دامەزران.

## [ ٢ ] شمشێری نوێخوازیی:

مامۆستا دوای بەسەربردنی ماوەیەکی زۆر لە تەمەنی بە سیاسەت و هەوڵ و کۆششی دنیاییەوە بۆ قازانجی موسڵمانان و، پاشان دەرکەوتنی بێئەنجامیی ئەم کارانەی، وای بە چاک زانیی دەست بداتە خواپەرستییەکی زۆر بۆ ئامادەکردنی دەروونی، وەک خوای گەورە بیەوێ رای بێنێ بۆ بەرگەگرتنی ئەو هەڵوێستە ناهەموارەی ئەهاتە بەردەم موسڵمانان.

یەکێ لە قوتابیەکانی لە بارەیەوە ئەڵێ:

«هەموو شەوێ هەڵ ئەسا بۆ شەونوێژ، منیش جار جار چاوم لێ ئەبوو کە نوێژی ئەکرد و نەمئەتوانی بخەوم، جا کە ئەیبینیم بێدارم پێی ئەوتم:

- **تۆ کە بێداری دە هەڵسە وەرە لە پاڕانەوەدا بەشداریم بکە.**

بەڵام نەمئەزانی هیچ نزایەک بخوێنم، بۆیە پێمی ئەوت:

- **من ئەپاڕێمەوە و تۆیش بە دواما ئامین بڵێ.**

جا لە کاتی پاڕانەوەکەدا جار جار بێئاگا ئەبووم سەیری ئەکردم و ئەیوت:

- **منیش وەک تۆ بووم... تۆیش ڕا دێیت ».**

هەروەها یەکێ لە قوتابیەکانی کە ناوی موصطەفا صۆنگورە ئەڵێت:

مامۆستا هەتا تەمەنی گەیشتە هەشتا ساڵیی هەموو شەوێ بە بێپەڕاندن پێنج سەعاتی بە پاڕانەوە و خواپەرستیی بە سەر ئەبرد، بەڵام دوای ئەو تەمەنە هەموو شەوێ بە شەونوێژ دوو سەعاتی بە سەر ئەبرد و ویرد و پاڕانەوەکانی بە رۆژا ئەخوێند.

بەڵێ، مامۆستا دەستی لە سیاسەتی فروفێڵ شۆریی..

چونکە سەرنجی دا ئەم سیاسەتە خزمەتێکی ئیمان و ئیسلام ناکات لە بەرامبەر ئەو هەموو دژایەتییەوە کە ئەکرا بەرامبەریان..

بۆی دەرکەوت هێرشکردنە سەر دەوڵەتێ کە دژی قورئان وەستاوە لە سەر مینبەر و لە سەر لاپەرەی رۆژنامەکان هیچ کەڵکێکی نیە و ئاڵای کوفری پێ داناگیرێتە خوارەوە، بەڵکو ئەو جۆرە «جیهاد»ە ئەبێتە مایەی پەروەردەکردنی کۆمەڵێکی پەلەکەر و هێرشکەر و هیچنەکەر، لە هەمان کاتا ماوەدانی پیاوخراپان تا دەست لە ئیمان بووەشێنن.

بۆی دەرکەوت سیاسەت بەو شێوەیە کە پاکیی و پەروەردەی دڵ بخرێتە ئەو لاوە، کارێکە دوژمنان حەزی پێ ئەکەن، چونکە لادانە لە کاری بنەڕەتیی و خۆخلافاندنە - بە نیازی چاکەوە - بە کارێکەوە کە هەرگیز قازانجی بۆ ئیسلام تیا نیە، بۆیە ڕێگای پاک و خاوێنکردنەوەی دڵی گرتە بەر تا بناغەی قەڵای ئیمان بە پتەویی دابڕێژرێ و هیچ قوڵنگەیەک نەتوانێ لەرزەی پێ بخا.

بەڵێ، ئەو هەموو ڕووداوە تاڵ و ناهەموارانە کە بە سەر جیهانی ئیسلامییدا هاتن کارێکی زۆریان کردە سەر مامۆستا نوورسیی تا مرۆڤێکی نوێی لێ دەرچێ بە تێگەیشتنێکی ئیمانیی نوێوە..

بە هەموو هێزێکیەوە و بە بێ دوودڵیی شمشێری نوێخوازیی هەڵ کێشا و هەڵمەتی دایە سەر بیروهەستی کۆن و لاواز و بێکەڵکی و دای بە زەوییدا.. گۆڕێکی هەڵکەند و سەعیدی کۆنی تیا ناشت و لە هەمان کاتا شادیی نواند بە لەدایکبوونی سەعیدی نوێ، بەو ئاواتەوە سەعیدی نوێ بتوانێ ئەرکی گرانی جیهادی ئیسلامیی و پارێزگاریی نەمامی ئیمان بخاتە ئەستۆیەوە لە ژێر دروشمی پەناگرتن بە خوای گەورە لە شەڕ و خراپەی شەیتان و سیاسەت کە ئەیوت:

« اعوذ بالله من الشيطان والسياسة ».

مامۆستا لە پەیامەکانیا ڕوونی کردۆتەوە کە مەبەستی لەو سیاسەتە کە پەنای بە خوا گرتووە لێی و نەفرینی لێ دەکا، ئەو سیاسەتەی ئەمڕۆیە کە لە سەر بەرژەوەندیی و خۆپەرستیی وەستاوە، بێ ئاوڕدانەوە بە لای ڕاستیی و دادا، وە ناوی ناوە دوڕندەیەکی سامناکی بیروهەست.

مامۆستا دەری ئەخا کە قورئان بە توندیی موسڵمانان قەدەغە ئەکا لە خەریک بوون بەم جۆرە سیاسەتەوە(٢). مامۆستا خۆی هۆی ئەم دوورکەوتنەوەیە باس دەکات:

**« ڕۆژێکیان پیاوێکم دی سەروسیمای لە هی زانایان دەچوو، ناوی زانایەکی بەڕێزی بە خراپە دەبرد، بە ڕادەیەک کە گەیاندیە ئەوەی بە کافری لە قەڵەم بدات. ئەوەش تەنها لە بەر ئەوەی لە چەند بابەتێکی سیاسییدا ڕایان جیاواز بوو، هەر لە هەمان کاتدا مەدحی یەکێکی مونافیقی ئەکرد کە لە بیروڕای سیاسییدا هاوبیر بوون ! بەم ڕووداوە تووشی لەرزینێکی توند بووم و پەنام بە خوا گرت لەو بارودۆخەی کە سیاسەتی تێ کەوتووە و وتم: «اعوذ بالله من الشيطان والسياسة»، ئیتر هەر لەو کاتەوە لە ژیانی سیاسیی کشامەوە ».**

مامۆستا نوورسیی کە پشتی لە سیاسەت هەڵ کرد وەنەبێ وازی لەو کارە چاکەخوازییە هێنابێ کە ئاواتی هەموو مرۆڤێکی خاوەن هەست و سۆزە.

مامۆستای خەمخۆری مرۆڤایەتیی حەزی لەم دەستبڕینە نەبوو.. حەزی لە ماندووکردنی ئادەمیزاد نەبوو.. حەزی لە ماڵکاولیی داماوان و وێرانیی شار و

(٢) چونکە قورئانی پیروز ئەفەرموێ: ﴿ولا تزر وازرة وزر اخرى﴾(الاسراء: ١٥) بەڵام سیاسەتی ئەمڕۆ بە پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیروزەوە ڕەفتار دەکات.

دیٰهات نەبوو .. چونکە ئـەیزانی دوژمنانی مرۆڤایەتیی لە ژێر پەردەی سیاسەتا پیلانێکی پڕستەمیان نەخشە کێشاوە، وە جگە لە ڕێبازێ کە لە قورئان هەڵ گوزرابێ بۆ چەرخی نوێ، هیچی تر بە کەڵک نایە.. ئەو ڕێبازەی کە مایەی گەشانەوەیەکی ئیمانیی بێ بۆ گەلانی جیهان و هەموو هێز و توانایەکیان بخەنە کار تا لە لافاوی ئەو فرِوفێڵ و گزیکاریە ڕزگاریان بێت کە خۆرئاوای بێئیمان جڵەوی بە دەستەوە گرتووە و سەرزەویی بە گشتیی و جیهانی ئیسلامیی بە تایبەتیی پێ ژێربار دەکات.

زیاد لەمە مامۆستا خۆی هەندێ خاڵمان ئەخاتە پێش چاو:

یەکەم: سەعیدی کۆن چەند خۆی ماندوو کرد لە پێناوی سیاسەتدا هەوڵ و کۆششی بە با چوو.

دووەم: سیاسەت لەمڕۆدا پڕیەتی لە درۆ و خەڵەتاندن، ئیتر با ئەوە بووەستێ کە موسڵمان لە خواپەرستیی ئەخات.

سێیەم: ئەگونجێ لە ڕێگای سیاسەتەوە، موسڵمان مەقاشی دەستی بێگانە بێت و بە خۆیشی نەزانێ !

چوارەم: ئەگەر هێز و چەک لەو ڕێگایەدا بە کار بهێنرێت ئای کە گوناه و تاوانێکی زۆر و ئەوباڵێکی بێئەندازە ئەکەوێتە ئەستۆی ئیمانداڕەوە، بە تایبەتیی سـەرۆک و فەرماندە، بەوەی کە مافی داماوان پێشـــێل بکرێت و بێئەنجام تووشی زەرەر و زیان ببن !!

### [٣] جیهادی ڕاستەقینە:

مامۆستا بڕوای بە ئاڵ و گۆڕی هێمن و لە سەر خۆ بوو، تا باری ژیان تێک نەچێ و بەو بۆنەوە سەرەنجام خەڵکی تووشی زیانی نالەبار نەبن، ئەمەش دوای ئەوەی وەک مرۆڤێکی ورد و دڵسۆز سەرنجی هەموو شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی دا لە صەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا. بە نموونە ئەو کارە منالانەی کە کۆمەڵەی «اتحاد و ترقي» کردیان.

هەر لەم ڕوانگەیەوە بوو وا مامۆستا ڕای لە سەر بانگی ئاشتی بوو و ڕێگای نەئەدا لە ناو خاکی ئیسلامدا جیهادی چەکدارانەی ناوخۆ بەرپا بکرێت. چونکە ئەو کارە تەنها خزمەتی دوژمنی دەرەوە ئەکات کە دوژمنی ڕاستەقینەی کۆمەڵگای ئیسلامییە، بۆیە پێویستە جیهادی چەکدارانە بەرامبەر بە دوژمنی دەرەوە بێت، وە لە بەر ئەوەی دوژمنی کافر حەزی لە بە گژاچوونی ناوخۆیی موسڵمانان هەیە و پێی خۆشە موسڵمانان لە جەنگی براکوژییدا

خۆیان ماندوو بکەن، چاک وایە لەم هەڵوێستەدا خۆیان لادەن و لە نـــاو کۆمەڵگای ئیسلامییدا خەریـکی جیهادی مەعنەویی بن ، ئەوەیش بە ڕووناک کردنەوەی بیرو پەروەردەکردنی دڵ و ڕۆحی موسڵمانان لە سەر چاکەخوازیی، تا بەم کارە ڕێک‌وپێکە ئەو وێرانکارییانە کە ساڵەهای ساڵە لە ڕەوشت و دڵ و دەروونی موسڵمانانا کاری خۆیان ئەکەن چاک بکرێنەوە ئەمەش بە پێی نهێنیی ئیخلاس.

مامۆستا جیاوازییەکی زۆری دائەنا. لە نێوان جیهادی دەرەوە و جیهادی ناوخۆی خاکی ئیسلامدا، چونکە جیهادی چەک‌دارانە ئەبێتە مایەی بەرپابوونی ئاژاوە.. هەڵگیرانی یاسا و دەستوور.. پێشێل‌بوونی مافی خەڵکیی.. پەیدابوونی پێشەوا و پاڵەوانانی کارتۆنیی و دەست‌کرد.. کوژران و فەوتان و تالان و بڕۆی داماوان.. کورتەکەی وێران‌بوونی هەر ناوچەیەک کە پریشکی بگاتێ، بۆیە داوای پارێزگاریی ئاسایشی ولاتی ئەکرد تا کاری بە سوودی ئیجابیی ئەنجام بدرێت.

مامۆستا وا بیری ئەکردەوە بناغەیەکی پتەو لە قوتابییە دڵسۆزەکانی دارێژێت و خزمەتی ئیسلامیان پێ بکات، ئەوە بوو ئیشارەتی بۆ دوورگەیەکی نێو دەریاچەی «وان» ئەکرد و ئەی‌وت:

**« ئەگەر لەم دوورگەیەدا دە ساڵ بمێنمەوە و خەریکی پەروەردە کردنی پەنجا قوتابیی بم، ئەوا ئەم‌توانیی بەو پەنجا قوتابییە ئیسلام لە هەموو جیهانا بلاو کەمەوە ».**

# هەڵوێستی ژیرانە

[ ١ ] کاری بێ‌ئەنجام:

مامۆستا لە لاپاڵی کێوی بڵند و سەرکەشدا خەریکی خواپەرستیی بوو.. لە ئەندێشەی دوارۆژی ئیسلام و موسڵمانانا بوو، هەروەها مرۆڤایەتیی.. لە چێژ و لەزەتێکی ئیمانیی زۆر بەرزدا ئەژیا.. قوتابیە دڵسۆزەکانی هەندێکیان بە دەوریا ئەوانیش دەوریان ئەبینی.. دەورەیان ئەبینی، خۆیان ئامادە دەکرد.. دلانی تینووی تریش سەریان لێ ئەدان و بە شنەی قوتابخانەی ئیسلام فێنک ئەبوونەوە.

دەوڵەتی ئەو کاتەی تورکیاش رۆژ بە رۆژ پەردەی لە سەر نیازە لار و وێرەکانی و دوژمنایەتیی بۆ ئیسلام و موسڵمانان لا ئەدا و مل‌شۆڕیی بۆ دۆژمنانی خاک و وڵات، ئاشکرا دەکرد.

ئەوە بوو خەڵکیی بە ناوی پارێزگاریی شەریعەتەوە جەنگی سەربەخۆییان کرد و وایان زانی بۆ خزمەتی ئیسلامە..

خەڵکیی بێزار بوو.. نیازی شۆڕشی چەکدارانەش کەوتە سەری هەندێ لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی کوردنشینەوە، تا دژی حکوومەتی ئەنقەرە بووەستن کە بە ئاشکرا ئاڵای دژایەتیی ئیسلامی هەڵگرتبوو.

مامۆستا ئەو هەواڵەی بیست کەوا «شێخ سەعیدی پیران»، پیاوی ناوداری نێو عەشیرەتە کوردەکان، نیازی شۆڕشی هەیە دژی «ئەنقەرە».

شۆڕش‌گێڕان داوایان لە مامۆستا نوورسیی کرد تا بەشدارییان بکات، بەڵکو سەرکردایەتیی وەرگرێ و رێنمایی شۆڕش بکات. کەچی ئەم وەک داواکەی بەجێ‌نەهێنان ئامۆژگاریشی کردن کە واز لەم کارە بێنن.

بە لایانەوە سەیر بوو.. چ سەرکردە و چ خەڵکیی، هەموو کەسێ ئەزانی «بدیع الزمان» چەندە نارەزای هەڵوێستی موصطفا کەمالە، ئەبوایە بە تەواوەتیی دڵی بەم شۆڕشە خۆش بوایە و. پشت‌گیریی لێ بکردایە، بەلام مامۆستا دەمێکە وازی لە دەست‌گرتن بەم هۆیەوە هێناوە: ئەو کاتەی پشتی لە سیاسەت هەڵ کرد، چونکە دەی‌زانیی بە زیانی موسڵمانان تەواو ئەبێ و بەس. خۆ دیارە سیاسەتێ لەمڕۆدا چەکی لە پالا بێ هەرگیز بە تەما نەبی ئیسلامی تیا بەرپێوە ببرێ، ئیتر ئەو هەمووە تاوان و گوناهانە با بوەستن کە دەرهەق

داماوان ئەکرێن، لە هەمان کاتا دەسەلاتی پایتەخت بیانووی دەست ئەکەوێ و بە یارمەتیی هێزە خوانەناسەکانی دەرەوە و ناوەوە ئەدەن بە تەوقەسەری گەلی ڕەش و ڕووتی نیازپاکدا و ماڵکاول و ڕەنجەڕۆی ئەکەن.

دۆست و دوژمن لە غیرەت و ئازایەتیی نوورسیی شارەزا بوون، پیاوی خۆ لادان و خۆشاردنەوە نەبوو.. بەلام بە فەراسەتی موسڵمان و هیدایەتی قورئان و تاقیکاریی تەمەنی و زیرەکیی و بلیمەتیی، گەیشتبووە ئەو بڕیارە کە پێویستە تەنها لەو ڕێگایەوە کە خۆی هەڵی بژاردبوو، بیر لە بەرژەوەندیی موسڵمانان بکرێتەوە !

چەند جارێ داوای بەژداریی دووبارە کرایەوە، کەچی هەموو جارێ مامۆستا ئەم داوایەی دەدایە دواوە، چونکە مرۆڤێکی شارەزا و وریای وەکو ئەو حەزی لە ڕژانی خوێنی موسڵمانان نەبوو لە پێناوی کارێکی بێ ئەنجام و بێ‌هوودەدا.

## [ ٢ ] جەنگی براکوژیی:

جارێکیان حوسەین پاشا، کە ئەویش یەکێ بوو لە سەرەک عەشیرەتە کوردەکان، هات بۆ لای مامۆستا بۆ سەر کێوی ئەرەک و داوای لێ کرد فەرمان بدا بە سەر قوتابیەکانیا بچنە دەرەوە و وتەیەکی نهێنیی لەگەڵ خۆیدا هەیە. مامۆستا ئەمەی بە دڵ نەبوو و وتی:

**- حوسەین پاشا، ئەم قوتابیانەم وەکو ئەندامی لاشەم وان.**

حوسەین پاشا دەستەسڕێکی پڕ لە زێڕی دەرهێناو وتی:

- ئەم زێڕە زەکاتی سامانی خۆمە، زەکاتیش منەتێکی تیا نیە، بۆیە تکام وایە لێم وەرگری تا دابەشی بکەیت بە سەر هەژارانا و لێیشی خەرج کەیت بۆ قوتابیی و میوانەکانت.

مامۆستا تووڕە بوو و وەری نەگرت و پێی وتی:

**- پاشا، ئایا پرست بە یەکێ لە زانایان و شارەزایان نەکردووە ؟ ئایا نازانی زەکات نابرێ بۆ شوێنێکی تر ؟ ئایا لە گوندەکەی خۆتا لە خزم و کەس و کارت هەژارێک نییە ؟ دەی کەواتە بۆ هێناوتە بۆ ئێرە ؟ .**

دەرکەوت ئەم زەکاتە لە بەرتیلەوە نزیکە، ئەوە بوو وتی:

- هاتووم بۆ لات تا لە کارێکدا ڕات وەرگرم.. سەربازەکانم بە تەواوەتیی ئامادەن.. چەک و تفاق و ولاغم هەیە و چاوەڕوانی ئیشارەتێکی جەنابتین.

**- چی ئەڵێیت ؟ نیازت وایە چی بکەیت ؟ لەگەڵ کێدا ئەجەنگێیت ؟**

- لەگەڵ موصطەفا کەمالا ئەجەنگم.

**- ئەی سەربازەکانی موصطەفا کەماڵ کێن ؟**

- نازانم چی بڵێم ! سەربازن وەک ئەزانیت.

**- ئەو سەربازانە رۆڵەی ئەم نیشتمانەن. واتە خزمی من و خزمی تۆن. جا تەقە لە کێ ئەکەیت ؟ ئەوانیش تەقە لە کێ ئەکەن؟ بیر کەرەوە و تێ بگە. ئایا ئەتەوێ ئەحمەد موحەممەد بکوژێ و حەسەن حوسەین بکوژێ ؟!**

- من مەرگم بە لاوە چاکترە لەم جۆرە ژیانە.

**- ژیان تاوانی چیە ؟ ئەگەر تۆ لە ژیان بێزار بوویت، تاوانی ئەو هەموو موسڵمانە و ئەو هەمووە هەزارانە چیە ؟ چییان لێ داوا ئەکەیت ؟**

حوسەین پاشا سەرسام بوو و نەیئەزانیی چی بڵێ، دەم و چاوی گۆڕا، دوای ئەوە وتی:

- بە ڕاستیی پشتت سارد کردمەوە.. من ئێستا ناوێرم بچمەوە بۆماڵەوە، چونکە عەشرەتەکەم کۆبوونەتەوە و چاوەڕوانی بڕیارمن، جا ئەگەر بچمەوە لایان و ئەمەیان بۆ باس بکەم ئەوا ئەڵێن: حوسەین بە ترسنۆک دەرچوو. بە ڕاستیی منت هێنایەوە سەر سفر.

**- جا باکت چیە ئەگەر پایەت لە نێو خەڵکا سفر بێت، بەڵام لای خوای گەورە وەربگیرێیت و ڕەزامەندبیت دەست کەوێ ؟**

[٣] شەریعەت نابێتە داردەست:

دوای چەند ڕۆژێک لە لایەن بەڕێز شێخ سەعیدی پیرانەوە نامەیەکی بۆ هات:

«بەڕێزم ! دەسەڵاتتان زۆرە، جا ئەگەر بفەرموون و لەم بزووتنەوەیەماندا بەشداریی بکەن، ئەوا سەر ئەکەوین».

مامۆستا وەڵامی دایەوە:

«... ئێمە موسڵمانین، تورکەکانیش برامانن، جا مەکەنە کارێ برا برا بکوژێت، ئەمە لە شەرعا ڕێی نادرێ، شمشێر لە ڕووی دوژمنە بێگانەکاندا نەبێ بەرز ناکرێتەوە، و شمشێر لە ناوەوەدا بەکار ناهێنرێت. تاکە ڕێگای بەردەممان لەم چەرخەدا بۆ ڕزگار بوو بریتییە لە ڕێنمایی خەڵکیی بۆ سەر ڕاستییەکانی قورئان و ڕاستییەکانی ئیمان و قەڵاچۆکردنی نەزانین، کە گەورەترین دوژمنمانە، بۆیە وای بە چاک ئەبینم واز لەم هەوڵەتان بێنن، چونکە دۆڕان چارەنووسیەتی و هەزارەها پیاو و ئافرەت تیا ئەچن بە هۆی چەند پیاوکوژ و تاوانبارێکەوە».

گوێ شل نەکرا بۆ ئامۆژگارییەکانی مامۆستا و شۆڕش بەرپا کرا و زۆرێ لە عەشرەتە کوردەکان تیا بەشدار بوون.

دوای کەمێ لە هەڵگیرسانی شۆڕش هەندێ لە سەرۆکەکان کە یەکێ لەوانە حوسەین پاشا بوو، بڕیاریان دا پەیوەندیی بە مامۆستا نوورسییەوە بکەن و بەشداریی پێ بکەن.

ئەوە بوو مامۆستا هەموو ڕۆژێکی جومعە دائەبەزیی بۆ نوێژی جومعە لە مزگوتی «نوورشین» لە شاری «وان». دوای نوێژی جومعە لەگەڵ مامۆستا کۆبوونەوە، کە چاوی پێیان کەوت هەستی کرد ئەم کۆبوونەوە بێ ئەو نیە، بۆیە ئاوڕی دایەوە بۆ لایان و پێی وتن:

**« بەڕێزان ! بێگومان بە بیروهەستی سەلبیەوە هاتوون بۆ ئێرە ».**

حوسەین پاشا لە بری ئەوان وەڵامی دایەوە: بەڵێ. دوای ئەوە باسی ئەوەی کرد کە نیازیانە ماموستا لەم کارەیاندا بەشدار بکەن.

مامۆستا نوورسیی پێی وت:

**«من زوو زانیومە کە بیرت پڕە لەم بیروهەستە هەڵانە، ئەم بیروهەستانە تەنها هەڵە نین، بەڵکو بیروهەستی نەفامانەشن. نازانم چ هۆیەکە پاڵت پێوە ئەنێ تا بە دوای ئەم بیروهەستانەدا بگەڕێی؟ من پرسیارتان لێ دەکەم: ئایا بەمە دەتانەوێ شەریعەت جێ بەجێ بکەن؟ ئەم جموجووڵ و هەڵس وکەوتە لە بناغەدا پێچەوانەی شەریعەتە...»**

بوێ ڕوون کردنەوە کە وا دەر دەکەوێ دەستی دەرەوە، پاڵ بەم بزووتنەوەیەوە بنێ، نابێ داواکاریی شەریعەت بکرێتە داردەست بۆ دژایەتیی و پێچەوانەی شەریعەت. هەروەها بۆ حوسەین پاشای ڕوون کردەوە کە بە خۆی و سەربازەکانیەوە ناتوانن خۆیان لە کوشتن و برین و دزیی و جەردەیی بپارێزن کە هەریەک لەم کارانە دژی شەریعەتە. جا وا چاکە واز لەم بیرە بێنن.

مامۆستا لە شار دەرچوو و بەرەو کێوی ئەرەک گەڕایەوە.

بەم ئامۆژگاریانە حوسەین پاشا و پیاوەکانی وازیان هێنا و مامۆستا بووە مایەی پاراستنی خوێنی هەزاران بێتاوان..

ئەمە بەڵگەیە کە مامۆستا نوورسیی، لەگەڵ ئەوەدا کە ڕازیی نەبوو بە ڕژانی خوێنی موسڵمانان، لە هەمان کاتا متمانەی نەدەکرد بە تێگەیشتن و توانا و لێهاتنی ئەوانە کە داوای شۆڕشیان دەکرد، تا بتوانن موسڵمانانە دژی دەوڵەت بوەستن و موسڵمانانە لەگەڵ خەڵکا ڕەفت بکەن..

ئەمە وانەیەکی زۆر گەورەیە بۆ موسڵمانان:

* مامۆستا نوورسیی لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیە و ڕازیی نیە موسڵمانان بە ناوی داوای حوکمی شەریعەتەوە ئاژاوە بەرپا بکەن.
* ڕازیی نیە موسڵمانان دەست بدەنە براکوژیی و خوێنیان بە ناڕەوا بڕژێ.
* ڕازیی نیە تاوانی بەدەم موســـڵمانبوون و ڕەفتنەکردن بـــە ئیسلامی بێگەرد، بخرێتە ئەستۆی ئیسلام.

مامۆستا نوورسیی بڕیاری نەدا بەشداریی شۆڕش بکا بەڵکو لە سەر کێوی «ئەرەک» خەریکی خواپەرستیی بوو.. عەشیرەتەکانی دەور و بەری شاری «وان»یش بەشدارییان نەکرد چونکە چاوەڕوانی فەرمانی مامۆستا بوون.

شۆڕش دەستی پێ کرد و دوای مەینەتێکی زۆر سەری نەگرت و زیانێکی زۆر لە موسڵمانان کەوت، ئەوە بوو دڕندەکان دەمیان نایە خوێنی موسڵمانانەوە و خەڵکێکی زۆر لە سێدارە دران و ترس و لەرزێکی کەموێنە خرایە دڵی خەڵکەوە، بەمە دەوڵەت بیانووی دەست کەوت تا سەرۆکی عەشیرەتە کوردەکان بگرێت و دووریان بخاتەوە بۆ شار و ناوچەی دوور و بیانخاتە ژێر چاودێرییەوە.

[ ٤ ] ڕەهەندەیی:

ئەوە بوو ژاندرمەکان مامۆستا نوورسییشیان لە بیر نەچوو و لە بیست و پێنجی شوباتی ١٩٢٥دا مەفرەزەیەک سەربازیان نارده سەر کێوەکە بۆی تا دای گرنە خوارەوە[١].

لە ڕێگادا قوتابیەکانی ئامادەییان دەر بڕیی تا بیڕفێنن بۆ وڵاتێکی ئیسلامیی تر، بەڵام مامۆستا ڕازیی نەبوو و ئامۆژگاریی کردن بە بێ دەنگ بگەڕێنەوە ماڵەکانیان.

هەواڵی گیرانی مامۆستا گەیشتە دانیشتوانی «وان»، هەزارەهایان دەستیان دایە چەک بۆ ڕزگارکردنی مامۆستا و فڕاندنی بۆ شوێنێکی هێمن، بەڵام مامۆستا ئەمەی نەویست و دەری بڕیی کە بە ویستی تەواوی خۆیەوە ئەچێت لەگەڵ سەربازەکاندا بۆ «ئەنادۆڵ» و ئاواتی سەلامەتیی و بێوەیی هەموو لایەکە.

---

(١) گرتنی مامۆستا نوورسیی بە هۆی ئەوەوە بووە، کە کاتێ شێخ سەعیدی پیران دەستبگیر کرا نامەیەکی مامۆستا نوورسیی لە گیرفاندا بوو. هەر چەندەش ناوەڕۆکی نامەکە ساردکرنەوەی شێخ سەعید بوو لە شۆڕشکردن، بەڵام کاربەدەستان مامۆستا نوورسییان پێ تاوانبار کرد. چونکە لەمەوە بۆیان دەرکەوت کە هەر چۆن بێ ناسراوییەک لە نێوان ئەم دوانەدا هەیە لە بەر ئەمە فەرمانی گرتنی ئەمیش دەرچوو.

کاروانی ڕەهەندەکانی شاری «وان» کە لە صەدەها پیاو و پیر و منالْ پێک هاتبوو و فرمێسکیان بۆ شارەکەیان دەڕێژا، لە شار دەرچوو و هەر چوار دەوریان بە سەربازی چەک‌دار گیرا بوو.

بە چەند شەو و ڕۆژێک گەیشتنە «ارضروم» و هەفتەیەکی تیا مانەوە و دوای ئەوە گەیشتنە «طرابزون» و بیست ڕۆژی تیا مانەوە و، ئەوسا بە پاپۆڕ لە وەرزی بەهارا گەیشتنە «ئستەمبوولْ» و (٢٥-٢٠) ڕۆژی تیا مانەوە.

دوای ئەوە فەرمانی گواستنەوەی مامۆستا بۆ شاری «بووردوور» دراو لەوێیش حەوت مانگ مایەوە، ئەم ماوەیە هەر خەریکی خواپەرستیی و نووسینی پەیامی «دەروازەی یەکەمی نوور» بوو کە بریتیی بوو لە چەند وانەیەکی قورئانیی و هەر بە دەست لە لایەن قوتابیان و خۆشەویستانیەوە دەنووسرایەوە و بلاو دەکرایەوە.

دوای ئەوە فەرمان درا ببرێت بۆ شاری «ئیسپارتە» و چەند مانگێکیش لەوێ مایەوە. لەوێیش نەیانهێشت بحەوێتەوە، فەرمان دەر چوو بی‌گوێزەنەوە بۆ گوندی «بارلا» کە لە شوێنێکی دوور و کەناردا بوو(٢)..

مامۆستا نوورسیی تاوانێکی نەکرد بوو.. بەڵکو ژیانی گۆشەگیریی - بۆ خواپەرستیی - ئەدایە سەر.. وازی لە سیاسەت و فرِوفێڵەکانی هێنا بوو.. بەڵکو بە هیچ شێوەیەک دژی دەوڵەت نەئەوەستا.. بەلام ئەیانزانی کارێکی یەکجار گەورەی وا بە دەستەوە.. ئەیانزانی خەڵکێکی زۆر بە فەرمان و ڕای ئەو ئەجووڵێنەوە.. بۆ ئەمە زۆر لێی ئەترسان و حەزیان ئەکرد لە خۆشەویست و دۆستانی دووری خەنەوە، بەڵکو ڕووناکیی بیروباوەڕەکەی بکوژێتەوە و ئەوان ڕزگاریان بێت.. بەلام سۆزی بەلێنشاوی خوای گەورە وەها جوولا بوو کە ئەم هەموو ئەشکەنجە و ئازارەی بدەن.. دەربەدەری بکەن.. دڵی پاکی وەک پەڕەی گوڵی بژاکێنن.. تا دەست لە دونیا بشوا.. تا هەوڵی قیامەت بە ڕاستیی بدا.. تا دڵەکەی بە تەواوەتیی ببەسرێت بە پەروەردگارەوە و تووشی غەفڵەت نەبێ..

تا دەرمانی دلانی چەرخی نوێ بنووسێ و لە خوانەناسیی و بێباوەڕیی، مرۆڤایەتیی ڕزگاری بێ و نووری قورئان دڵەکان ڕۆشن کاتەوە.

ئەوانەی دژی موسڵمانان دەوەستن، داماون و خۆیان ماندوو دەکەن.. هەرچی ئەوان بی‌کەن بە قازانجی ئیسلام و موسڵمانان تەواو دەبێت.

شەوکەت دەمیرئای، ئەو سەربازە بوو مامۆستای گواستەوە بۆ «بارلا»، لە بیرەوەریەکانیا دەڵێ:

---

(٢) سەیری پەیامی «زڵلەی میهرەبانیی» بکە. وەرگێڕانی مامۆستا«فاروق رسول یحیی».

«لەشاری (ئەگریدیر) بووم، بەیانییەکیان بانگیان کردم بۆ بنکەی شارەوانیی.. چووم بۆ ئەوێ فەرماندار و فەرماندەی ژاندرمە و ئەندامانی دەستەی شارەوانیی لەوێ بوون لەگەڵ پیاوێکی مێزەربەسەر کە لە گرێی چوارەمی تەمەنیا بوو و جبەیەکی لە بەر بوو و سەروسیمایەکی بەویقاری هەبوو.

فەرماندەی ژاندرمە رووی تێ کردم.

ـ کورم، گوێ بگرە، پێویستە لە سەرت ئەم مامۆستامانە کە بە «بدیع الزمان» ناسراوە ببەی بۆ «بارلا»، ئەم کارەی ئەستۆت زۆر گرنگە، وە کاتێ لەوێ بە پۆلیسخانەی ئەسپێری با لە سەر نووسراوە رەسمییەکان ئیمزا بکەن و ئێمەیش ئاگادار بکە.

وتم: زۆر چاکە گەورەم.

لەگەڵ مامۆستا پێکەوە دەرچووین و لە رێگادا پێم وت:

ـ مامۆستا گیان، جەنابت لە جێی باوکمی، بەڵام ئەمەش کارە و خراوەتە ئەستۆم، هیوادارم لێم نەرەنجێنی».دوای ئەوە باسی گەشتەکەیان بە بەلەمی چارۆکەدار ئەکا:

«زۆر سارد بوو.. وەرزی زستان بوو.. ئاوی دەریاچەکەش بەینا و بەین بەستبووی، یەکێ لە سەوڵلێدەرانی بەلەمەکە لە پێشەوە بە داردەستێکی گەورە سەهۆڵەکەی ئەشکان و رێگای بۆ بەلەمەکە ئەکردەوە.

مامۆستا «بدیع الزمان» دەستی کرد بە دابەشکردنی هەندێ مێوژی وشک و شیرینیی بە سەرمانا.

بەوردیی سەرنجیم ئەدا ئەبینم تەواو هێمن و دامەزراوە.. لە دەریاچەکە و چیاکانی دەوروبەرمان ورد دەبۆوە.

جا چونکە رۆژ کورت بوو خێرا نوێژی عەسر هاتە کایەوە و، ویستی بە پێوە نوێژەکەی بە جێ بێنێ، ئێمەیش بەلەمەکەمان روو بە قیبلە وەستان و دەنگێکم کەوتە گوێ ئەیوت:

ـ الله اکبر !..

لە هەموو ژیانما «الله اکبر»م بەو سام هەیبەت و خشووعەوە نەبیستبوو.. هەستم بە گرژبوونی مووی لەشمان ئەکرد.. هەڵس و کەوت و رەفتارەکانی لە رەفتاری مامۆستایانی تر نەئەچوو کە ئێمە ناسیبوومانن. ئەوپەڕی هەوڵمان ئەدا تا بەلەمەکە روو بە قیبلە بوەستێنین. کاتێ مامۆستا لە نوێژەکەی بۆوە، ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و وتی:

ـ **سوپاستان ئەکەم براکانم، ماندووم کردن !**

بەراستیی پیاوێکی نەرم و نیان و رەوشتجوان بوو».

# ئاوارەیی و بێنازیی

[ ١ ] یەکەم قوتابخانەی نووریی:

مامۆستا لە سەر کێوی «ئەرەک» داگیرایە خوارەوە و بەرەو «ئەستەمبووڵ» برا و دوای بیست ڕۆژێک گوێزرایەوە بۆ «بووردوور» و لەوێیش حەوت مانگ مایەوە، ئنجا برا بۆ «ئیسپارتە» و چەند مانگێکیش لەوێ مایەوە، دوای ئەوێیش فەرمان دەرچوو بیبەن بۆ «بارلا».

«بارلا» ناحیەیەک بوو سەر بە «ئیسپارتە» و لەگەڵ «بووردوور» دا هەرسێکیان زۆر لە یەکەوە دوور نەبوون و ئەکەوتنە خۆرئاوای تورکیاوە. ئەم ڕۆیشتنەی بۆ «بارلا» لە زستانی ١٩٢٦ دا بوو.. کە گەیشت یەکەم شەو لە پۆلیسخانە مایەوە. دوای ئەوە خانوویەکی بچووکی دوو هۆدەیی بۆ تەرخان کرا کە ئەیڕوانی بە سەر سەوزایی و ڕەز و باخ و باخاتە ڕازاوەکانی بارلادا کە تا دەریاچەی «ئەگریدیر» درێژ بووبوونەوە.

چیاکانی ئەگریدیریش کە بە داری کاژ داپۆشرابوون چوار سەعات لە بارلاوە دوور بوون، کەوتبوونە لا تەنیشتی دەریاچە جوانگیلەکە و ئەویش دوو دوورگە لە ناوەڕاستیا بوو..

لەو کاتەدا هەورێکی ڕەشی چڵکن ئاسمانی تورکیای داپۆشیی بوو.. بەرهەمی تاڵی بەناو ڕۆشنبیران پێگەیی بوو.. لە سەردەمی خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمیدا هەڵپەیەکی زۆر ئەکرا و بگرە و بەردەیەکی بێئەندازە هاتبووە کایەوە، گوایا داوای سەربەستیی دەکەن، بەڵام تەنها ئەو سەربەستیە درا بە میللەت، کە دڵی دوژمنانی ئیسلامی پێ فێنک بێتەوە..

بەڵێ، کاربەدەستان دەستیان دایە زوڵم و زۆر و لەسنووردەرچوون.. بە ئاشکرا دژایەتیی ئیسلام دەکرا و هەوڵێکی بێوچان دەدرا بۆ کوژاندنەوەی ڕووناکیی خوا و دوورخستنەوەی میللەت لە ئەحکامی شەریعەت، گوایا داوای پێشکەوتن و شارستانییەت دەکەن.

بۆ ماوەی چارەکە صەدەیەک واتە هەتا ساڵی ١٩٥٠ هەوڵێکی زۆر درا بۆ ئەوەی گەلانی تورکیا ، ئیسلامیان لە بیر بچێتەوە و خۆشویستنی ئیسلام لە دڵیانا ڕیشەکەن بکەن ، بۆ ئەم مەبەســــتە هەموو هەنگاوێک گیرایەبەر، بەڵام بێهوودە بوو. ناچار کەوتنە هەوڵی ئــەوە بەڵکو بەرەی داهاتوو لەســــەر دووری

لە ئیسلام پەروەردە بکەن، بەوەی کە بە هیچ شێوەیەک نەهێڵن لە ئیسلام تێ بگا و نەهێڵن لە ڕاستیی شارەزا بێ و چی سەرچاوەی تێرکردنی ڕۆح و مێشکیەتی وشکی کەن. بۆ ئەمەش خوێندنی وانەی ئایین لە قوتابخانەکاندا قەدەغە کرا .. پیتی نووسینی ئیسلامی گۆڕران بۆ پیتی لاتینیی .. حوکمی شەریعەت لا برا و دەوڵەتێکی عیلمانیی دروست کرا .. لە سەرانسەری وڵاتدا دادگای زۆر و زەبەندە بەرپا کرا و ترس و لەرزێکی بێ‌ئەندازە خرایە دڵی خەڵکەوە، زانایانی ئیسلام دەستە دەستە برانە بەردەم سێ‌دارە. هەر کەسێ دوو لێوەی دژی دەوڵەت بکردایەتەوە سێ‌دارە بەشی بوو.

یەکێ لەو کارانەی کە کاربەدەستانی ئەو ڕۆژە ڕەشە دژی ئیسلام دەیان کرد گرتنی مامۆستا نوورسیی بوو. گرتیان و دووریان خستەوە بۆ «بارلا» تا لە ناوچەی خۆی و ناسراوانی و قوتابییەکانی دوور کەوێتەوە و لە یادیان بچێ و ئەم سەرچاوە پڕ خێر و بەرەکەتەی ئیسلام وشک بێ..

سەعیدی کۆن لە ناوچەی کوردستانی عیراقیشدا ناوبانگی بووە، هەتا لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخدا پەیوەندییەکی ڕۆحیی بووە کە دوای مردنیشی هاتۆتە خەوی مامۆســــتا نوورسـیی کاتی لەگەڵ پیرەمێردی شاعیردا لە «ئەستەمبووڵ»، لە کاتی ڕوداوی سی و یەکی مارتدا بەند بوون، مژدەی داوەتێ کە ناکوژرێن و ئازاد دەبن(۱).

بەڵام بە گۆڕانی بە سەعیدی نوێ ئەو ناوبانگەی لەم نزیکانەدا نامێنێ لە بەر دوورکەوتنەوەی لە ناوچەکە و پەیدابوونی سنووری دەست‌کردی دەوڵەتە کافرەکان و، وەرنەگرتنی بیروهەستی سەعیدی نوێ کە خەڵکیی لە بەر پەلەو دوورەبینیی‌نەکردن لێی تێ نەئەگەیشتن.

کاربەدەستان بە خەیاڵی خۆیان کارێکی خراپیان دەرهەق مامۆستا کرد.

با غەریبیی و بێ‌کەسیی و بێ‌دەرامەتیی و خەم‌وخەفەت و پیریی هەر هەموویان دەوری سەعید نوورسیی بدەن، بەشکوم کاری تێ‌بکەن و واز بێنێ.

ئەمە خەیاڵی خاوی سەربازانی شەیتانە..

بە درێژایی مێژوو ئەمە پیشەیان بووە و جارێ بۆ جارێ پەند وەر ناگرن.

چونکە شەیتان واز لە کاری خۆی ناهێنێ و هەموو جارێ ئەم فلیمە کۆنە بە شێوەیەکی تر لێ دەدرێتەوە.

مامۆستایش وەک ئیمان‌دارێکی ڕەببانیی، پەیمانی بە خوای خۆی داوە بەندەی بێت.. شوێن‌کەوتەی ئایینەکەی بێت.

---

(۱) پێشەکیی پەڕاوی «مناقبی کاک احمد» نووسینی خواجە ئەفەندیی و پێشەکی‌یەکە بە قەڵەمی پیرەمێردە.

﴿ انهم يكيدون كيداً وأكيدُ كيداً.. ﴾ (الطارق: ١٥، ١٦)

ئەوانە، نەخشە ئەکێشن دژی ئیسلام، وا ئازاری مامۆستای خواناس دەدەن، خوایش دەفەرموێ: ئەو نەخشە بە حسابی خۆتان بکێشن، تا ئەو نەخشە بکەمە مایەی سەرکەوتنی ئایینەکەم..

فیرعەونی بەدبەختیش هەر وای کرد..

نەخشەی کێشا کوڕپان سەر ببڕێ نەوەکو بۆ دوارۆژ مەترسیی بخەنە سەر کورسیەکەی، بەڵام ئەوەی بە خێو کرد کە لێی دەترسا..

بەدبەختەکانی تورکیاش، مامۆستایان دوور خستەوە کەچی، ئەوەی ئەوان لێی دەترسان لەوێ هاتە دیی[٢].

بەڵێ، ئەم شارە بچکۆلەیە بووە سەرچاوەی تیشکی ئیسلامیی کە لەوە و دوا سەرانسەری تورکیای ڕووناک کردەوە، بە شێوەیەک کە نوور و ڕووناکیی گەیشتە هەموو شار و گوندێک..

مامۆستای خواناس بە نیازێکی پاک و خۆشویستنێکی بێئەندازەی ئایینەکەی و ترسێکی زۆری قیامەت و دڵسۆزیی موسڵمانانەوە لە شارە خنجیلانەکەی «بارلا»دا دەستی دایە خواپەرستیی.. دڵەکەی بە ڕاستیی و پاکیی تەسلیمی خوا کرد..

لە بەردەم خانووە بچکۆلەکەیدا کانیاوێکی سازگار، بە فەرمانی خوا، هەڵقوڵا بوو کە ساڵ دوانزە مانگە وشکی نەدەکرد..

هەروەها لە بەردەم خانووەکەیدا درەختێکی گەورەی قنج و قایم چوو بوو بە ئاسمانا، کە بەهاران و هاوینان هەزارەها باڵندەی بچووکی دەنگخۆش بە سەر لقە زۆر و زەبەندەکانیەوە دەیانجریوان..

کە وەرزی هاوین هاتە بەرەوە دارتاشێک ژوورێکی بچووکی سەرنەگیراوی وەک کەپر لە تەختە بۆ دروست کرد و خستیە ناو لق و پۆپی ئەم درەختە بەرز و بڵندەوە.

مامۆستا زوربەی کاتی لە وەرزی بەهار و هاویندا لەم ژوورەدا بە سەر دەبرد، تیایا خەریکی خواپەرستیی و وردبوونەوە و بیرکردنەوە و نووسینی پەیامەکانی نوور بوو کە زوربەی شەوان هەتا بەرەبەیان نەدەخەوت، ئیتر دانیشتوانی بارلا نەیاندەزانی مامۆستا کەی دەخەوێ و کەی بەخەبەر دێ..

---

(٢) هەر کەسێ بە هەر نیازێکەوە دژی پەیامەکانی نوور بجووڵێتەوە، بە خۆی نازانێ، بە فەرمانی خوا، کارێ ئەنجام دەدات کە دوایی بە قازانجی پەیامەکان دەردەچێت، جا خۆزگە ئیمانداران، بە نەزانیی، خۆیان گوناهبار نەکردایە.

هەرکەسێ لە بێدەنگیی شەودا بە لای ئەو درەختەدا تێپەڕیایە ئەوا گوێی لە دەنگی قورئان خوێندن و ذیکر و شەونوێژی مامۆستا دەبوو.

لەم شارەدا و لەم خانووەدا مامۆستا هەشت ساڵ و نیو مایەوە، کە زوربەی پەیامەکانی نووری تیا نووسی، بەمە ئەم خانووە لەداڕدروستکراوە بە یەکەم قوتابخانەی نووریی دەژمێرری.

هەرچەندە لە کەس و کار و قوتابیەکانی دابڕ کرا و ناچار کرا ژیانی تەنیایی بباتە سەر، بەڵام خوای گەورە سۆزی بەلێشاوی ڕژاند بە سەریا و شەو و ڕۆژ سەرگەرمی خواپەرستیی بوو.

## [ ٢ ] دەستپێوەگرتن:

مامۆستا لاشەی ناساغ بوو، بۆیە کەم خواردنی دەخوارد، هەتا دەگونجێ بوترێ سەرانسەری ژیانی بە نیوەتێریی و نیوەبرسیی بە سەر بردووە، لە شەو و ڕۆژێکدا قاپێکی بچووک شۆربا و یەک دوو لەتە نانێکی بەس بووە. وە لە لایەن دراوسێکانیەوە خواردنی بۆ دەهات. و ئەویش هەر بە زۆر پارەی لە جیاتیا دەبڕیین بە سەرا، چونکە دروشمی درێژایی تەمەنی بوو کە هیچ شتێک بە بێ بەرامبەر لە کەس وەر نەگرێ، ئیتر هەموو ژیانی کە سەرانسەری دوورخستنەوە و دەربەدەریی و بەندیی بوو، بەو لیرە زێڕانەی کە پاشەکەوتی کردبوون و بەو دەست پێوەگرتنە پڕ لە سەلیقەیە و بە بەرەکەتی خوایی بردۆتە سەر.

مامۆستا باسی خۆی بۆ نموونە بۆ موسڵمانان دەکا. تا سەرمەشق بێ بۆیان و دەڵێ:

**« بەشێک لەو سەرۆک عەشیرەتانەی کە لەگەڵا دوور خرابوونەوە بۆ «بوورردوور» هەوڵیان دا و زۆریان لێ کردم (زەکاتیان) لێ وەربگرم تا دووچاری بێدەستیی و موحتاجی نەبم لە بەر کەمیی ئەو پارەیەی کە پێم بوو، منیش بەو سەرۆکە دەوڵەمەندانەم ووت:**

*( هەر چەندە پارەکەی من زۆر کەمە، بەڵام من دەستپێوەگرتنم هەیە و لە سەر قەناعەتیش ڕاهاتووم، لە بەر ئەوە من گەلێ لە ئێوە دەوڵەمەندترم ).*

**لەبەر ئەوە زۆرلێکردن و دووبارەکردنەوەیانم دایە دواوە.. ئەوەی کە شایانی سەرنجدانە بەشێک لەوانەی کەدەیان ویست زەکاتەکەیانم بدەنێ، دوای دوو ساڵ بوون بە ژێر قەرزەوە، لە بەر دەستپێوەنەگرتن، بەڵام ئەو پارە کەمەی من - سوپاس بۆ خوا - بەو بەرەکەتەی کە خوای گەورە خستوویەتە**

**دەستپێوەگرتنەوە، بۆ ماوەی حەوت ساڵ، بەشی کردم، ئیتر خەجاڵەتیم پێ نەهات و ناچاری نەکردم موحتاجبی خۆم بە خەڵکیی بکەبەنم و ئەو یاسایەی کە بۆ ژیانم بڕیارم دابوو، کە بریتی بوو لەوەی هیچ شتێ لە کەس وەرنەگرم، لێم تێک نەچوو ».**

مامۆستای خواناس لە غەریبی و تەنیاییدا هەر خەریکی پەروەردەی دڵەکەی بوو، بە شەو و بە ڕۆژ کاتی بە فیڕۆ بەسەر نەئەبرد. دەوڵەتیش کە فرێی دابوویە «بارلا» هەروا وازی لێ نەدەهێنا، بەڵکو چاودێرییەکی وردی دەکرد و ئاگاداری هەموو هەڵس و کەوتێکی بوو.. دانیشتوانی بارلایش لە ترسی دەوڵەت نەیان دەوێرا نزیکی بکەونەوە و وت‌ووێژی لە گەڵا بکەن.. دەوڵەت خۆی چاک مامۆستا نوورسیی دەناسیی، بەڵام دانیشتوان وایان دەزانی ئەم پیاوە لە سەر شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دوور خراوەتەوە.

بەمە زۆربەی کاتی لە ماڵەوە بەسەر دەبرد و لە وەرزی بەهار و هاوینیشدا دەر ئەچوو بۆ سەر چیاکانی ئەگریدیر و لەوێ بە تەنیا و لە سەر لووتکەی شاخەکە و لە نێو درەختەکانا کاتی بە خواپەرستیی و وردبوونەوە بە سەر دەبرد..

[ ۳ ] ئاوارەیی و خەم و خەفەت:

ئەوەی ژیانی غەریبیی و تەنیایی و بێ‌کەسیی نەچەشتبێ نازانێ ئەم جۆرە ژیانە چەند سەختە.

ئەوەتا مامۆستا خۆی باسی ئەو بارودۆخەمان بۆ دەکات:

**« کاتێ کە لە ڕەهەندەبیدا بووم ـ ئەو دیلییە پڕئێش و ژانە ـ بە تاقی تەنیا و بێ کەس و دوور لە خەڵک لە سەر لووتکەی چیای «چام»، کە دەڕوانێ بەسەر سەوزەڵانیی بارلادا، دەژیام.. لەو تەنیایی و گۆشەگیرییەدا لە شوێن نوورێک دەگەڕام.**

**شەوێکیان، لەو ژوورە بچکۆلە سەرنەگیراوەدا، کە لە سەر درەختێکی کاژی بەرز دامەزرابوو، لە سەر لووتکەی ئەو بەرزاییە، سەیرم کرد پیرییەکەم چەندین ڕەنگ و جۆری ئاوارەیی بە یەکا تاڵا و ئەنوێنێ ـ وەک لە مەکتووبی شەشەمدا بە ڕوونی هاتووە ـ جا لە بێ‌دەنگیی ئەو شەوەدا کە نە شوێنەوارێک و نە دەنگێک هەبوو جگە لەو زایەڵە و دەنگ‌دانەوە خەمناکەی گەڵای درەختەکان، هەستم کرد کە ئەو زایەڵە پڕئێش و ژانە جەرگەی هەست و سۆزمی پێکاوە و کاری کردۆتە سەر ناخی پیریی و ئاوارەییم.**

**بۆیە پیریی، بۆ ئاگادارکردنەوە چرپاندی بە گوێی دڵدا و ووتی:**

*ـ هەروەک ڕۆژی ڕووناک گۆڕا بەم گۆڕە تاریکە و دنیا کفنی ڕەشی پۆشی، ئەوا ڕۆژی تەمەنیشت ئەگۆڕێ بۆ شەو و ڕۆژی دونیایش بۆ شەوی بەرزەخ و ڕۆژی هاوینی ژیانیش بۆ شەوی زستانی مردن.*

**نەفسیشم بە ئێش و ئازارەوە وەڵامی دایەوە:**

*بەڵێ، هەروەک من لێرەدا لە شارەکەم ئاوارەم و لە جێ و ڕێی خۆم دووژم، جیاییم لە خۆشەویستە زۆر و زەبەندەکانی سەراسەری تەمەنم، کە لە پەنجا تێپەڕ بووە و، جگە لە فرمێسک ڕشتن بە دوایانا هیچی تر شک نابەم، خۆی لە خۆی‌دا ئاوارەییەکی سەخت‌ترە لە ئاوارەیی شار و کەس و کارم..*

**من لەم شەوەدا هەست بە ئاوارەییەکی زیاترخەفەتاویی و ئازار توندتر دەکەم لە ئاوارەییم بە سەر لووتکەی ئەم چیاوە کە بەرگی ئاوارەیی و خەفەتی پۆشیوە. چونکە پیریم ئاگاداری ئەکردم بە نزیک بوونەوەی وادەی جیابوونەوەی یەکجارییم لە دونیا و هەرچی وا تیایا..**

**جا لە نێو ئەم ئاوارەییەدا کە بەخەفەت گەمارۆ دراوە و لە دوو توێی ئەم خەفەتەدا کە ئاوێتەی ئێش و ئازارە، دەستم کرد بە گەڕان لە دووی نوورێک، لە شوڵەی هیوایەک، لە دەرگای ئومێدێک.**

**خێرا «ئیمان بە خوا» هات بۆ بەهاناوەهاتن و پشت‌گرتنم، ئاسوودەییەکی گەورەی پێ بەخشیم، بە شێوەیەک ئەگەر ئازار و خەم و خەفەتەکەم چەند جارە ببوونایە ئەو ئاسوودەییە بەس بوو بۆ شیفای دەروونم ».**

[ ٤ ] یەکەم قوتابیی نوور:

مامۆستا لەم ژیانە سەخت و پڕ لە ئازارەدایە و دانیشتوانی بارلایش هەموو جارێ ئەبینن وا ئەم زانایە لە ماڵ دەر ئەچێ بەرەو چیاکە، یا لەوێوە بەرەو ماڵ ئەگەڕێتەوە، تاقە کەسێکیان نەی‌ئەوێرا قسەی لەگەڵا بکا. یا لێی نزیک بێتەوە، چونکە دەوڵەت خۆشی ناوێ و هەر کەسیش پەیوەندیی لەگەڵ ئەما ببەستێ ئەچێتە ڕیزیەوە، بۆیە بە پێویستیان نەئەزانی خۆیان بکەنە دوژمنی دەوڵەت. مامۆستا هەروا بێ کەس مایەوە، تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان کە وەرزی هاوین بوو، مامۆستا وەک ڕۆژانی تر لە ماڵ دەرچوو و بەرەو چیاکە کەوتە ڕێ. ئاسمان سایەقە بوو.. هەر ئەوەندە بوو مامۆستا گەیشتە سەر لوتکەی چیاکە، هەوری ڕەش بەری ئاسمانی گرت و زۆری پێ نەچوو هەورە گرمە و چەخماخە دەستیان پێ کرد و بارانێکی زۆر و بە گوڕ هاتە خوارەوە..

لە سەر لوتکەی چیاکە مامۆستا تەنیا بوو، پەنایەکیش نەبوو تێی چێ تا خۆی لە تەڕبوون بپارێزێ جگە لە درەختەکان کە ئەوانیش لە بەر زۆریی بارانەکە دادیان نەئەدا. ماوەیەکی زۆر باران باریی، دوای ئەوە کەم بوویەوە و وردە وردەش هەر دەباریی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام وەک دەڵێن دەزووی وشکی لێ بڕا بوو هەر لە تەوقسەریەوە هەتا پەنجەی پێی خووسابوو، لە رێگای گەڕانەوەشا پێڵاوەکەی پچڕا.. کە گەیشتەوە شار تاکە پێڵاوەکەی گرتبوو بە دەستەوە و بە گۆرەوییە خورییە سپیەکانیەوە بە رێدا دەچوو.

کۆمەڵێ لە دانیشتوانی بارلا لە سەر کانیاوەکە کۆ بووبوونەوە و خەریکی وت و وێژ بوون، ئەم دیمەنە کاریگەرەی مامۆستایان بەرچاوکەوت. ئەو مامۆستا ئاوارە و بێ‌کەسەی کە ئەمان زاتی ئەوەیان نیە سەلامیشی لێ بکەن، وا پێڵاوە پچڕاوەکەی بە دەستەوە گرتووە و گۆرەوییەکانی چەقیونەتە ناو قوڕ و چمکی جلەکانیشی قوڕاوی بووە.

بێ‌دەنگیی و ماتەمینیەک باڵی بە سەر هەستی خەڵکەکەدا کێشا. خێرا دوو جۆرە سۆزی جیاواز بە دڵی زۆربەیاندا هات: سۆزێک کە بە پەلە هەڵسێ و دەستی یارمەتیی بۆ مامۆستا درێژ کا، سۆزێکیش ترس بوو لە جاسووسەکانی دەوڵەت کە بە وردیی موراقەبەی ماموستایان دەکرد.. لە ئەنجاما لە ناو کومەڵی خەڵکەکەدا پیاوێک کە ناوی (سولەیمان) بوو پێی نا بە جەرگی خۆیا و هەموو مەترسییەکی خستە لاوە و، دەرپەڕی و خۆی گەیاندە مامۆستا..(٢) پێڵاوەکەی لە دەست وەرگرت و لە حەوزەکەدا بە جوانیی بۆی شۆرد و لە گەڵیا کەوتە رێ بۆ ماڵەوە هەتا گەیاندیەوە ژوورەکەی..

مرۆڤ کەمێ وێژدانی هەبێ مووچڕکە بە لەشیا دێت، وا «بدیع الزمان» لە وڵاتی ئیسلامدا ئەوەندە بێ‌نازە.. نەک هەر ئەو بەڵکو هەموو خواناسێک لە هەموو کاتێکدا.. ئەممەش ئەگەڕێتەوە بۆ بێ ئاگایی و خەواڵوویی موسڵمانان.

سولەیمان مامۆستای بردە ماڵەوە.. هەموو گیانی خووسا بوو.. بەشی زۆری جلەکانی قوڕاویی بوون.. ئاگری بۆ کردەوە و، جلەکانیشی بۆ وشک کردەوە..

سولەیمان مەترسیی خستە ئەو لاوە و لەگەڵ مامۆستادا بوونە ئاشنا.. بوونە مامۆستا و قوتابیی.. جا قوتابییەک بێ مەبەستی دنیایی لە مامۆستا نزیک بێتەوە، زۆر راستگۆ و بەوەفا دەر دەچێت، هەوڵ و کۆششەکانی پڕخێر و بەرەکەت ئەبن..

---

(٢) سولەیمان نموونەی راستیی و وەفا و دڵسۆزیی بوو، هەروا لە سەر ئەم رەشتانەی بەردەوام بوو تا ئەوە بوو لە ٦ی مایسی ١٩٦٥ دا ئەم جیهانەی بەجێ هێشت و بەرەو قیامەت رۆیی.. مامۆستا لە پەیامەکانیا بەوپەڕی رێزەوە ناوی ئەبات بە تایبەت لە «پاشکۆی بارلا» دا.



وێنەی مامۆستا کاتێ لە ساڵی ١٩٢٦دا بۆ یەکەم جار هاتە «بارزان» کە هەر لە ڕێوە گیراوە.



لە کاتێکا مامۆستا «نوورسیی» لەسەر ئەم درەختە بە بیرکردنەوە و خواپەرستیی کاتی بە سەر دەبرد لە هەمان کاتدا یەکەم مەکتووبیشی هەر لەوی نووسی.

بەلێ، سولەیمان لەو ماوەی هەشت ساڵەدا یارمەتیی مامۆستای داو وانەی لە لا خوێند و، بووە ئەڵقەی گەیاندنی مامۆستا بە کەسانی تر، ئەوە بوو بەرە بەرە کەسانی تریش نزیک بوونەوە و کۆڕی قوتابییان فراوان بوو..

مامۆستا کەوتەوە ناو گوڵ و گوڵزار و، خونچەکان بەرە بەرە دەمیان ئەپشکووتی و دەوروبەریان ئەڕازاندەوە.. دەستی دایە نووسینی پەیامەکانی نوور، بەڵام ئەو ڕۆژە پەیامەکانی قاچاخ بوون، بە پێی یاسا خوێندنەوە و نووسینەوەیان یاساخ بوو، هەتا ئەوە بوو بۆ ماوەی بیست ساڵ لە شەش پارێزگای تورکیادا چاودێریی قوتابییان و پەیامەکانی مامۆستا دەکرا..

قوتابییەکانی «بارلا» بەوپەڕی چالاکییەوە پەیامە یاساخەکانی مامۆستایان بە نهێنیی دەخوێندەوە و هی تریان لە بەر دەنووسییەوە و بە سەرانسەری تورکیادا بڵاویان دەکردنەوە.

بەمە گرتن و ڕاونان و سزادان ڕووی کردە قوتابیانی نوور، ئەوانیش بە شانازییەوە شانیان دەدایە ژێری و زیاتر غیرەت دەیگرتن.. ئەم قوتابییانەی بارلا بوونە یەکەم دەستەی قوتابیانی قوتابخانەی نوور.

# پەیامەکانی نوور

[ ١ ] پەیامی «حەشر»:

دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوثمانیی و هاتنی دەستە و تاقمی تازە بۆ سەر حوکم، باری ئیسلام کەوتە لێژیی و، میریی بە شێوەیەکی بێوێنە بە هەموو توانا و دەسەڵاتێکیەوە کەوتە دژایەتیی ئیسلام، ڕۆژانی ڕەش باڵیان بە سەر وڵاتا کێشا. بوومە لەرزەیەکی گەورە هەموو بینای ئیمانی هێنایە لەرزە و خەریک بوو لە بناغەدا دەری بێنێ.

هۆیەکانی بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن کەوتنە هەڵەت و هێرشێکی گەورە بۆ سەر ئیمان و ئیسلام.. پێنووسە چاوبەستراوەکان بووبوونە نۆکەری کافر و قەڵای ئیسلامیان بە سەر یەکا ئەڕووخاند.. ڕۆژنامە، گۆڤار، پەڕاو، سینەما، شانۆ، هەموویان خەریک بوون، شان بە شانی قوتابخانە، بۆ پێگەیاندنی بەرەیەک کە وەک هیچی لە بارەی ئیسلامەوە نەئەزانی، لە هەمان کاتا، بە دڵ و بە گیان دژیشی بووەستێ..

ئیسلام چاوبەستی کردووین..

ئیسلام دوای خستووین..

ڕەوشتی ئیسلام بۆ ئەم چەرخە ناشێ..

ئیسلام مافی ئافرەتی نەداوە..

زۆرێ لـــەمانە خرانە مێشـــکی بەرەی تـــازەوە و ئەویش کوێرانە ، بەوپەڕی لێبڕانەوە، هەوڵی ئەدا بڵاویان کاتەوە و بەرەی پێگەیشتووی پێ تێ گەیەنێ..

لە هەمان کاتا هەڵگرانی ئیسلام بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست درانە قەڵەم و ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام خرانە پشت گوێ..

ڕاستی لا برا و درۆ خرایە شوێنیەوە..

پاکیی لا برا و ساختە و ڕووکەش و گزیکاریی و دەستبڕیین هاتنە شوێنیی.. خزمەتی گەل و وڵات کرایە دروشمێکی ساختە بۆ گیرفانپڕکردن و ڕابواردن و بەرەڵایی..

هەر کاتێ ئیسلام لە کۆمەڵ دوور خرایەوە، گومانی تێدا نیە، بارودۆخی خەڵکیی ئەگاتە ئەم ڕادەیە..

هەر کەسێک نیازی ببوایە بەرگری لە بیروباوەڕەکەی بکات هەموو تۆمەتێکی ئەخرایە شوێن..



مامۆستا نوورسیی هاوینان دەهتە لای ئەم دەرختیی (قەتران)ە لسەر جیای (چام) کە بەسەر دەریایەی «ئەگریدر»دا دەروانێ.

مامۆستا نوورسییش، وەک دڵسۆزێکی تێگەیشتوو، بە وردیی سەرنجی ئەم بارودۆخەی ئەدا.. کەواتە ئیمان وا لـــە مەترســـــیدا و خەریکە لافاوی خوانەناسیی ڕای ماڵێ.. بناغە و بنەڕەتی ئیسلام، بە لای چینی تازەوە، بە گومان و دوو دڵیی وەرئەگیرێ..

بۆیە سەرنجی دا وانەوتنەوە و وەرگرتنی زانیاری و قوتابخانە، پێویستە دوای دامەزراندنی بناغەی ئیمان بایەخیان پێ بدرێ، کەواتە پێویستە سەرەتا هەوڵ بدا بۆ هەڵگرتنی سپاردە گەورەکە و شانبداتە ژێر هەموو مەینەتێکیەوە کە ئەویش بریتییە لە «ڕزگارکردنی ئیمان» لە تورکیادا.

ئەم کارە پێویستە بە خێرایی دەستی بدرێتێ..

ئەوەی پێویستە بیخەینە بەر چاو ئەمەیە: کافران هەوڵیان دا تورکیا پێش هەموو شوێنێک لە شوێنەکانی تری جیهانی ئیسلامیی، ئیسلامی تیا ڕیشەکەن بکەن، بۆیە هیچ وڵاتێک باری ئیسلام تیایا وەک تورکیا لار نەبوو بوو..

لە چ وڵاتێکدا مزگەوت کراوە بە مۆزەخانە و عەمبار ؟

یا بانگ بە شێوە شەرعیەکەی قەدەغە کراوە ؟... هتد

لەبەر ئەم بارە ناسکە بوو مامۆستا دەستی دایە نووسینی پەیامەکانی نوور. دوای تاقیکارییەکی زۆر و ئاگاداریی لە باری جیهان، خوای گەورە هیدایەتی دا ئەم پەیامانە بنووسێ، تا بناغەی ئیمان، بە هۆی بەڵگەکانیانەوە، لە دڵانا دا بمەزرێنێتەوە..

یەکێ لەو پەیامانەی کە لە سەرەتاوە نووسینی، پەیامی «حەشر» بوو. ئەوە بوو لە ڕۆژێکی ڕازاوەی بەهاردا مامۆستا لە ماڵ دەرچوو بۆ کەنار دەریاچەی بارلا، لەوێ خەریکی سەرنجدانی ئاوەکە و لووتکەی شاخە سەختەکان و سەوزەلانییە دڵڕفێنەکەی دەر و دەشت بوو.. تا دوێنێ بوو هەمووی کفنی سپیی بوو، وا ئێستە بۆنی خۆشی گوڵ و گوڵزار و دەنگی ناسکی باڵندەکان و تیشکی زێڕینی خۆر ئەم سەرزەوییەیان ڕازاندۆتەوە.. بە دەستی خۆی نەبوو، ئەم دیمەنە شەیدای کرد و ئەم زیندووبوونەوەیە ڕای چڵەکان و هێنایە یادی کە هەر بەم شێوەیە مردوانیش زیندوو ئەبنەوە و خوای گەورە دەسەڵاتی هەموو شتێکی هەیە.. ئەم ئایەتە پیرۆزەی هاتەوەیاد و بەو پەڕی تاسەوە دەستی‌کرد بە خوێندنەوەی:

﴿ فانظـر الى اثارِ رحمتِ الله كـيفَ يُحيي الارضَ بعدَ مـوتها إنّ ذلك لمحـيي الموتى وهو على كلّ شيءٍ قدير ﴾ (الروم: ٥٠ )

نزیکەی چل جار دووبارەی کردەوە..

ئادەمیزاد چەند داماوە کاتێ بڕوای بە قیامەت نیە! خۆ ئەم دیمەنە وەک فەیلەسووفێک ئەی‌بینێ، نەخوێندەوارێکیش ئەی‌بینێ..

ئای چەند تاوانبارن ئەوانەی کە ئادەمیزاد گومڕا ئەکەن؟! دەستەیەکن و بەرژەوەندیی خۆیان پاڵیان پێوە ئەنێ دەستی مرۆڤەکان ئەبڕن و لە ئیمان دووریان ئەخەنەوە..

دیمەنەکە ئایەتەکەی بیرخستەوە. ئایەتەکەیش هەست و سۆزی هێنایە جۆش و نووری خستە دڵەوە و مانا بەرزەکانی بۆ هاتن و ئەم ئەی‌وت و یەکێ لە قوتابیەکانی بۆی ئەنووسیی و لە ئەنجاما پەیامی «حەشر» دەرچوو.

زیاتر ئەوە پاڵی پێوە نا کە زیندووبوونەوە و هاتنی ڕۆژی قیامەت لەبەرچاوی بەرەی تازە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیی و زانستیانە پشتگیریی ناکات.. مامۆستا لە نووری ناوە جوانەکانی خواوە، زیندووبوونەوە و حەشر و دادگای قیامەت ئەسەلمێنێ و بە بەڵگەی نزیک و ئاسان ئەم باسە ئەباتە دڵی ئادەمیزادەوە.

سەرنجی ئادەمیزاد ڕا ئەکێشێ بۆ وردبوونەوە لە دەسەڵات و توانای خوای پەروەردگار لە ڕێک و پێکیی بوونەوەردا، بۆ وردبوونەوە لە ژیانی خۆی کە خەوتنی جۆرە مردنێکە و هەڵسانەوەی جۆرە زیندووبوونەوەیەکە، بۆ وردبوونەوە لە ڕووەکەکان کە چۆن سیس و وشک ئەبن و ئەمرن، دوای ئەوە سەر لە نوێ لە بەهاردا گەڵا و گوڵ ئەکەنەوە.

کەواتە ئەمە کرداری زیندووبوونەوەیە هەمیشە وا لە بەر چاوانا دووبارە ئەبێتەوە، ئیتر ڕۆژی قیامەت سەرسوڕمان و بە لاوە نەگونجانی بۆ چیە ؟!

بەم شێوەیە مامۆستا بە پێی پێویستیی و ئامادەبوونی ڕوحیی، نووری ئایەتەکانی قورئانی بۆ دەر ئەکەوت و بە هۆی قوتابیەکانیەوە ئەی‌نووسینەوە.

### [ ٢ ] نووسینەوە و پیاچوونەوە:

نووسینی پەیامەکانی نوور و بڵاوکردنەوەیان شتێکی تاک و ناوازە بوو، کە بیروهەستی ئیسلامیی تازە لە هیچ شوێنێکدا بەم شێوە و ڕێگایە بڵاو نەئەکرایەوە.

مامۆستا بی‌ویستایە هەر پەیامێک بنووسێ ئەی‌وت و قوتابییەکانی ئەیان‌نووسیی، مەگەر لە شوێنێکدا کە کەسی بە لاوە نەبوایە، دوای ئەوە قوتابیانی تر لە بەری بە دەست ئەیان‌نووسییەوە و هەر هەموویان ئەهێنایەوە تا مامۆستا خۆی یەک بە یەک پیایانا بچێتەوە و هەر هەڵەیەکیان تیا بێ ڕاستی کاتەوە.

عەبدوڵلا چاویش [1] ئەڵێ:

دوای خۆرئاوا بوون لە دێی «ئیسلام» دەر ئەچووم و لە جانتاکەما ئەو نامیلکانەم هەڵ ئەگرت کە «حافیظ عەلیی» ئەی‌نووسینەوە و بە درێژایی شەو بە پێ ئەڕۆیشتم هەتا لەگەڵ بەرەبەیانا ئەگەیشتمە «بارلا» و ئەبینم مامۆستا چاوەڕوانمە. بە شادمانییەکی بێ‌ئەندازەوە پێشوازیی لێ ئەکردم و پێکەوە نوێژی بەیانییمان بە جێ ئەهێنا، دوای ئەوە لێی ئەخەوتم بەم شێوەیە لە ڕۆژی داهاتوودا پەیامە تازە نووسراوەکانم لە مامۆستا وەرئەگرت و بە شەو لە بارلا دەر ئەچووم تا بگەمەوە «ئیسلام‌کۆی» و پەیامەکان بدەمە دەست «حافیظ عەلیی»[2].

مامۆستا لە کاتی نووسینا جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ پەڕاو و سەرچاوەیەکی بە لاوە نەبوو، جا ئەوەی یارمەتیی ئەدا لە سەر ئەم کارەی ئەو زیرەکیی و هێزە بەتینەی لەبەرکردن بوو کە خوای گەورە پێی بەخشیی بوو، بۆیە کەڵکی لەو زانیارییە زۆر و جۆرا و جۆرە وەر ئەگرت کە لە سەرەتای ژیانیەوە لەبەری کردبوو.

مامۆستا زۆری پێ خۆش بوو پەیامەکانی نوور بگەنە دەستی موسڵمانان، بەڵام چەند کۆسپێک لە بەر دەمیانابوو:

مامۆستا پەیامەکانی بە پیتی نووسینی عەرەبیی ئەنووسی و ئەم پیتانەش گۆڕرابوون بە لاتینیی و ئەمیش حەزی ئەکرد هەر بەو پیتانە بنووسێت و وازیان لێ نەهێنیێ وەک دروشمێکی ئیسلامیی، با لە یاد نەچنەوە. خۆ ئەگەر ڕێگەش لەو پیتانە نەگیرایە وا ڕێگا لە مامۆستا ئەگیرێ کە ئێستە ڕەهەندەیە و لە لایەن دەوڵەتەوە بە وردیی چاودێریی ئەکرێ. بۆیە چاک‌ترین ڕێگای بە کەڵک بە «دەست نووسینەوە» بوو بە نهێنیی.

خوای گەورە بەرەکەتی ڕژان بە سەر کارەکەی مامۆستادا، کۆڕی قوتابیانی زیادیان کرد و پەیامەکانیش ئەگەیشتنە دێ‌هات و ناوچەکانی دەوروبەری بارلا، موسڵمانان بە غیرەتەوە لە دەوری پەیامەکان کۆبوونەوە و خۆیان پێی پەروەردە دەکرد و بە نهێنییش ئەیان‌گەیاندن بە شارە دوورەکان کە لەوێش بەرە بەرە هیدایەتی دڵی تازە و ڕۆحی تینوویان ئەدا تا لەو شەوە تاریکە و بیابانە وشک و برنگەدا سەرگەردان نەبن..

---

(١) لە ١٨٩٥ لە دایک بووە و لە ١٩٦٠ دا کۆچی دوای کردووە.

(٢) یەکێکە لە قوتابییە پێشینەکانی مامۆستا و زۆر سوور بوو لە سەر نووسینەوەی پەیامەکانی نوور ئەویش بە بۆنەی ئەو هیممەت‌بەرزیی و خەت‌خۆشییەی کە پێی بەخشرا بوو، لە ساڵی ١٩٤٤ دا لە بەندیخانەی دەنیزلیی شەهید کرا، ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

پەیامەکانی مامۆستا دژی کەس نەبوون، بەڵگەی ئیمانیی بوون، دەربارەی قیامەت و زیندووبوونەوە بوون، بەڵام حکوومەتی ئەو ڕۆژەی تورکیا بڕیاری نەهێشتنی ئیسلامی دا بوو، نەک بگەڕێ بە دوای کەسانێکا کە ئاسایشی وڵات تێک بدەن. بۆ ئەم مەبەستەی دەستی دایە گرتن و بەندکردنی قوتابیانی نوور و ئەی‌دا بە سەر ماڵەکانیانا و دەستی بە پشکنین ئەکرد، کەچی قوتابیان بە سنگێکی فراوانەوە ئەچوون بە دەم ئەم کارەی دەوڵەتەوە و خۆیان ئامادەی هەموو سزایەک ئەکرد کە لە ڕێگای ئیماندا بێتە بەردەمیان، بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک دژایەتیی بکەن. لە سەر ئامۆژگاریی مامۆستایان زۆر بە نەرمیی ئەجوولانەوە.. کاری خۆیان پیاوانە و بە دڵســــۆزیی بە جێ ئەهێنا. هەر کاتێکیش بەند ئەکران وایان ئەدایە قەڵەم بۆ قوتابخانەکەی یووسفی پێغەمبەریان ئەبەن ـ سەلامی خوای لە سەر بێ ـ چونکە مامۆستا وا ناوی لێ نابوو بە بۆنەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە:

﴿ فلبث في السجن بضع سنين... ﴾ (یوسف: ٤٢)

موسڵمانانی تورکیا زۆر شەیدای ئیسلام بوون، جا کە دەوڵەت دژی ئایینەکەیان ئەوەستا، بە تایبەتی ئەو دژایەتیەی کە لەگەڵ پەیام و قوتابییەکانی نووردا ئەی کرد، ئەوانیش زیاتر دەستیان ئەدایە خوێندنەوە و بڵاوکردنەوەی پەیامەکان..

جا بە دەیان و، سەدان و، هەزاران لە قوتابیانی نوور بە پیاو و ئافرەتەوە، دەستیان دایە نووسینەوەی پەیامەکان، بە شەو و بە ڕۆژ هەر خەریک ئەبوون، بە ڕادەیەک هی وایان هەبوو ئەو سەرەی بۆ نووسینەوە دای‌خستبوو بەرزی نەئەکردەوە و ماوەی حەوت ساڵ بوو لە ماڵ دەر نەچوو بوو هەر خەریکی نووسینەوە بوو..

شان بە شانی پیاوان ئافرەتانیش ـ ئەوانەی توانای نووسینیان هەبوو ـ بەشداریی نووسینەوەیان ئەکرد، ئەوانەشیان کە نەخوێندەوار بوون بە وێنە و شێوەی نووسینەکە ئەیان نووسییەوە و وەک وێنەگرتن لە بەریان دەگرتەوە بێ ئەوەی بزانن بی‌خوێننەوە.

هەندێکی تر لە ئافرەتان ئەهاتنە لای مامۆستا و ئامادەیی خزمەت کردنی پەیامەکانیان دەر ئەبڕی بەوەی کە ئەوان وەک پیاوەکانیان توانای نووسینەوەیان نیە، بەڵام ئامادەن کاری سەرشانی ڕۆژانەی پیاوەکانیان ئەنجام بدەن تا ئەوان بە یەکجاریی لێ ببڕێن بۆ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور !!

بۆ ماوەی بیست ساڵ پەیامەکانی نوور لە سەرانسەری وڵاتا بەم شێوەیە بڵاو ئەکرانەوە دوای ئەوە بۆیەکەم جار لە دێی (ساوا) بە (ڕۆنیۆ) چاپ‌کرا.. شایانی باسە ئەم دێیە نزیکی «ئیسپارتە» بوو و هەزار نووسەرەوەی پەیامەکانی نووری تیا بوو. وە تا ساڵی ١٩٥٦ز، جگە لە پەیامی «حشر»، کە بە نهێنیی، بە بۆنەی یەکێ لە قوتابیەکانیەوە، لە «ئەستەمبوول» چاپ کرا، هیچ پەیامێکی تری ماوەی چاپ‌کردنی ئاسایی نەبوو.

## [٣] بانگی شەرعیی:

لەو کاتەوە کە دەوڵەتی بە ناو عیلمانیی هاتە جێی دەوڵەتی شەریعەتەوە، هەموو ساڵێ بڕیارێکی تازە، بگرە مۆدێلێکی تازە و بە ناو دەسکەوتی تازەتر، لە لایەن دەوڵەتەوە دەر ئەچوو.. ئەمەش بریتی بوو لە داهێنانی ئامێرێکی تازە بۆ ڕووخاندنی قەڵا و پایەکانی ئیسلام.

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٢ز[١] فەرمان لە دەوڵەتەوە دەرچوو بە قەدەغەکردنی بانگی شەرعیی و گۆڕینی بۆ زمانی تورکیی، کە صەدەها ساڵ بوو دەنگی ئەم بانگە لە منارەکانی دەوڵەتی عوثمانییەوە بەرز دەبوویەوە.

موسڵمانە تورکەکان ئەمەیان بە لاوە زۆر گران بوو، تا ئێستا لە هیچ وڵاتێکدا بانگ دەست‌کاریی نەکراوە.. ئەمە بەڵا و لێقەومانێکی گەورە بوو، کە دڵان پێی خەمبار و ماتەمین ئەبوون و چاوان فرمێسکیان لێ ئەڕژایە خوارەوە.. دەوڵەت بە یەکجاریی دژی ئیسلامە، بەڵام بە ناوی دژایەتیی عەرەبییەوە !!

بەڵێ، بڕیار دراوە قورئانەکانیش کۆ بکرێنەوە و باری وشتر بکرێن و بنێررێنەوە بۆ عەرەبستان.. بە ڕاستی گومڕا بوون و سەرگەردانیی دەردێکی گوڵ و کوشندەن کە تووشی ئادەمیزاد ئەبن..

سەرگەردانیی بۆ ئەوانەی دژی سروشتی (فیطرەتی) ئادەمیزاد ئەوەستن.. کێ ئەتوانێ ئیمان لە ئادەمیزاد بشارێتەوە ؟ ماوەیەک پاگەندە ئەکەن و خۆیان ماندوو ئەکەن، بەڵام سەرەنجام هەر ئیمان ئەی باتەوە !

ئەو مزگەوتە بچکۆلەی کە مامۆستا نوورسیی تیایا پێش نوێژی ئەکرد، خەڵکەکە سوور بوون لە سەر ئەوەی بانگ و قامەت لە ناو مزگەوتا بە شێوەی شەرعیی بە جێ بێنن..

---

(١) لە پەراوی (ذكريات عن سعيد النورسي) لاپەرە (٦٦)دا هاتووە کە لە ساڵی ١٩٢٨ دا بانگ بە شێوەی شەرعیی قەدەغە کراوە هەتا ساڵی ١٩٥٠.

ئەم هەواڵە گەیشتە بەڕێوەبەری پەخشداریی و ئەویش لە ناو مزگەوتا و لە بەشی تایبەتیی نوێژی ئافرەتانا هەندێ ژاندرمەی کردە کەمین تا ئەوانەی ئەو تاوانە ئەکەن لەو کاتەدا یەکسەر بیانگرن.

کۆمەڵێکیان گرت و لە چلەی زستانا درانە بەر بە پێ و بە ڕێگایەکی بەفراوییدا هەتا «ئەگریدیر».

بانگ‌وێژی مزگەوت بیرەوەریی ئەو ڕووداوەمان بۆ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ:

( چەندە ئازاریان داین لە سەر بانگ کاتێ کە بانگی تورکییان داهێنا ؟ مامۆستایەکی دوژمن بە بانگی شەرعیی و هەندێ زانای ئایین ئەیانوت: پێویستە گوێ ڕایەڵیی بۆ فەرمانی کاربەدەستان بکرێت.

بەڵام من ئەموت: من لەم قرە قرە سەیرەی ناویان ناوە بانگی تورکیی تێ ناگەم، ئیتر من چووزانم ئاهەنگێکی پڕ لە گاڵەم بۆ ئامادە ئەکرێ ؟!

ڕۆژێکیان دایان بە سەر مزگەوتەکەی مامۆستا نوورسییدا و من و عەبدوڵلا چاویش و موصطەفا چاویش و سولەیمان و عەلییان گرت و ئەوانی تریان دەرکردە دەرەوە.. بە پێ و بە سەر بەفرا بردینیان بۆ شاری ئەگریدیر و لەوێ خستینیانە بەندیخانەوە و نەیانهێشت کەس لەگەڵمان بدوێ، تا ڕۆژێکیان ئامادەی بەردەمی «مدعي عام» یان کردم و چەند ئەفسەرێک لە پلەی عەمید و عەقیدا لە لای بوون.. پێیان وتم:

ـ وەک بیستوومانە صەد و بیست و پێنج لیرەی زێڕت داوە بەو پیاوە کوردە (مەبەستی مامۆستایە). ئایا چەندێ چەک و فیشەکتان بەو پارەیە کڕی ؟!

ـ حکوومەتی تورکیا وەک کەشتیەک وایە، ئێوەش زاناترن چی دەچێتە ناو و دەر ئەچێت لەو کەشتییە. مامۆستا نە تۆپی هەیە و نە تفەنگ. بەڵکو ئەو ئەیەوێ دڵئارامیی وجۆریی بلاْوکاتەوە.

ـ ئایا منالت هەیە ؟

ـ بەڵێ.

ـ ئەگەر ڕاستگۆ نەبیت و ڕاستیی نەڵێیت سێدارە چاوەڕوانتە.

ـ ئەم پیاوە تەنها خزمەتگوزاری قورئانە، چی بکا بە تۆپ و تفەنگ ؟ تفەنگ و تۆپی ئەو قورئانە و بەس.

کاتێ دادگا دەستی پێ کرد حاکم لێی پرسییم:

ـ کێ بوو بە عەرەبیی بانگی دا ؟

بڕیارم دا خۆم بە کەڕ دەرخەم، بۆیە بە بێ جووڵە و وەڵام وەستام هەروەک پرسیارەکەم نەبیستبێ.

حاکم ئاوڕی دایەوە بۆ لام و پرسیی:
- ئایا ناوت سولەیمانە ؟
- لە بەر ئەوەی وەرزی زستانە، ڕۆژێ زووتر ئامادە بووم.
- پێم وتی ناوت چیە ؟
- گەورەم لە خان خەوتم.
حاکم تووڕە بوو، تووڕەبوونێکی توند بە دەوریا نواڕی و قیڕاندی:
- ئەم چەپەڵە بکەنە دەرەوە.

# قوتابخانەی یووسفیی یەکەم

[ ١ ] بەندیخانەی «ئەسکی شەهر»:

دوای ڕووداوی مزگەوت و گرتنی چەند قوتابیەک، لە ساڵی ١٩٣٤ دا، مامۆستا نوورسیی گوێزرایەوە بۆ شاری «ئیسپارتە». لەوێش چەند مانگێ مایەوە، کە خەریکی نووسینی ئەم پەیامانەی نوور بوو: (ئیقتیساد، ئیخلاس، پۆشتەیی«حجاب»، «الاشارات الثلاثە»، بیماران، پیران) کە ئەمانە هەموویان لە کۆمەڵە پەیامەکانی لەمعەلەرن، ئەوە بوو لە بارلادا پەیامەکانی سۆزلەر و مەکتووبات تەواو نووسرابوون.

لەوێش مامۆستا خەریکی خزمەتی ئیمانیی بوو، زیانێکی بۆ کاربەدەستان نەئەویست و دژایەتیەکی لێ دەرنەکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشا کاربەدەستان لێی بێ دەنگ نەبوون و وازیان لێ نەهێنا، بەیانییەک زوو لە مانگی نیسانی ١٩٣٥دا هێزێکی ژاندرمە دای بە سەر ماڵی مامۆستادا و دوای پشکنینێکی وردی سەرانسەری ماڵە بچکۆلەکەی، گرتیان. ئەوە بوو هەر لە هەمان ڕۆژا پۆلیس لە شوێنی جۆرا و جۆرا دایان بەسەر ماڵی صەد و بیست کەس لە قوتابیانی نووردا.

کۆت و زنجیر خرایە دەستی مامۆستا و قوتابیەکانی و بەرەو بەندیخانەی شاری «ئەسکی شەهر» ـ کە ئەکەوێتە باکووری خۆرئاوای وڵاتەوە ـ دایاننە بەر، تا لەوێ بەند بکرێن بە تاوانی دروستکردنی کۆمەڵەیەکی نهێنیی دژ بە دەوڵەت و هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی.

ڕێگای نێوان «ئیسپارتە» و«ئافیون» بە سەربازی چەکدار داپۆشرا بوو، و شاری «ئیسپارتە» لە ژێر چاودێریی سەربازییدا بوو..

چەند تاوانێکی گەورە درابوونە پاڵ موسڵمانەکان، کە ئەمانە هەندێکیانن:

١- دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنیی.

٢- هەوڵی ڕووخاندنی شۆڕشی کەمالیی.

٣- پێکهێنانی تەریقەیەکی صۆفیەتیی.

٤- بزواندنی ڕۆحی دینداریی، ئەمەیش بە بڵاوکردنەوەی پەیامی «پۆشتەیی ـ حجاب» کە دژی بڕیاری دەوڵەتە بۆ ڕووتیی ئافرەت. ئەمە هەمووی لە داخی ئەوەی نوورســیی دوورخراوە، ڕۆژ بە ڕۆژ بیرو هەستی

ڕێک‌وپێکی لە بارەی ئیسلامەوە، ئەچووە دڵی خەڵکییەوە.. جا خۆ ئەگەر ئەم تاوانانە بە ڕاست دەرچوونایە ئەوا لە سێدارەدان بەشیان بوو.. هەتا ئەوە بوو بۆ ترساندنی خەڵک و دوورخستنەوەیان لە پەیامەکانی نوور، دەوڵەت پاگاندەیەکی زۆری بە وڵاتا بڵاوکردەوە کە قوتابیانی نوور و مامۆستاکەیان لە سێدارە دەدرێن.

بەندییەکان گەیشتنە بەندیخانەی «ئەسکی شەهر» و مامۆستا نوورسیی بە تەنیا خرایە ژوورێکی بچووکەوە-و بە هەموو شێوەیەک تەنگیان پێ هەڵ ئەچنی تا بە ئازار و نارەحەت‌کردن کار بکەنە سەر وورەی و نەرم ببێ. بەڵام تا ئەوان زیاتر تەنگیان بە مامۆستا هەڵ چنیایە ئەم زیاتر لێ ئەبڕا بۆ نووسینی پەیامەکانی نوور. ئەوە بوو لەم بەندیخانەدا لەمعەی بیست و هەشتەم و بیست و نۆهەم و سییەهەم لەگەڵ تیشکی یەکەم و دووەم نووسراون.

بۆ ماوەی دوانزە ڕۆژ خۆراک لە مامۆستا و قوتابیانی قەدەغە کرا هەروەها چوون بۆ سەر ئاویان لێ قەدەغە کرا تا ناچار لایەکی زیندانەکەیان هەڵ کەند بۆ دەست بە ئاوگەیاندن..

مامۆستا ئەم بەندیخانەیەی ناو نا قوتابخانەی یووسفیی یەکەم لەبەر ئەو هەموو قازانج و سوودە ئیمانییەی کە تیایا دەستی کەوت.

لەم بەندیخانەدا ئیسلام دەست‌کەوتێکی تری بۆ گەیشت. ئەوە بوو بەشێکی زۆر لەو بەندی‌یانەی کە هەموو جۆر ڕەفتاری خراپیان هەبوو و تاوانی جۆر بە جۆریان کردبوو، کە لە نزیکەوە ڕەفتار و خواپەرستیی موسڵمانیان بینی، پەشیمانیی خۆیانیان دەربڕیی و بەڕاستیی گەڕانەوە بۆ لای خوا و بڕیاریان دا سەربازی گوێ‌ڕایەڵی ئایینەکەی بن.

## [ ٢ ] لە بەردەم دادگادا:

ماوەیەکی زۆر دادگا خەریکی پرس و وەڵام بوو لەگەڵ مامۆستا و قوتابییەکانیا کەچی شتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوت تا بتوانێ تاوانباریان کات، بەڵام بە هەر جۆر بوو بڕیاری دادگا دەرچوو بە بەندکردنی مامۆستا بۆ ماوەی یانزە مانگ لە سەر نووسینی پەیامی «پۆشتەیی ئافرەتان» کە لەمعەی بیست و چوارهەمە و داوای پۆشاکی ئیسلامیی ئافرەتانی تیا ئەکات.

مامۆستا برایە بەردەم دادگا و ئەو تاوانانەی کە درابوونە پاڵی خرانە پێش چاوی. ئەمیش پیاوانە بەرگریبەکی ژیرانەی لە کارە ئیمانییەکەی کرد، کە ئەمە بەشێکیەتی:

[ به پێی چەند ماددەیەک من بەند کراوم:
ماددەی یەکەم:
دادگا پێمان دەڵێ: ئێوە نیازتان وایە ئابێن بە جۆرێکی کۆنەپەرستانە بە کار بێنن، کە ئەمەش لەوانەیە ببێتە مایەی تێکدانی ئاسایشی گشتیی.
لە وەڵامی ئەم تۆمەتەدا ئەڵێم:
گوڵچانی کردنی کارێک، تەواو جیاوازیی هەیە لەگەڵ ڕوودانیدا، ئەمانە دوو کاری جیان. چونکە هەموو کەسێ ئەتوانێ کەسانی تر بکوژێت، ئەمەش گوڵچانە و بەس. جا ئایا ئەبێت ئەو کەسە بدرێت بە دادگا بە پێی ئەم گوڵچانە ؟ دەنکە شقارتەیەکیش ئەتوانێ ماڵێ بسووتێنێ، ئایا ئەبێت پاکەتە شقارتەکان لە ناو ببرێن بە بیانووی ئەم توانینی سووتاندنەوە ؟
دووەم: زانستە ئیمانییەکان کە ئێمە تیایانا سەرگەرمین و پێیانەوە خەریکین هەرگیزاو هەرگیز نابنە هۆ و پەیژە بۆ هیچ شتێکی تر جگە لە بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورە. جا هەر وەک خۆر نابێتە شوێنکەوتەی مانگ، هەروەها ئیمانیش کە کلیلێکی پیرۆزی نوورانیە بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی و خۆری ژیانی ئەو جیهانە، ڕێگ ناکەوێ بکرێتە هۆ و پەیژە بۆ بەرژەوەندیی دنیایی دوور لە مەبەستی ئیمانیی.
بەڵێ مەزنترین مەسەلە لەم بوونەوەرەدا و گەورەترین نهێنیی بۆ بەدیهێنانی جیهان نهێنیی ئیمانە. بۆیە لە بووندا مەسەلەیەک نیە لێی گەورەتر بێت تا لە ڕێگایا ڕام بکرێ و لە پێناویا بە کار بهێنرێت.
حاکمە بەڕێزەکان:
فەرمان دان بەم بەندکردنەم لەم ڕۆژە پڕ لە ئازارانەدا کە لە بەندییدا بە سەرم بردن، ئەگەر ئاراستەی شەخسی خۆم و ژیانی دنیاییم کرابایە، ئەوا هەرگیز جووڵەم لێوە نەئەهات و بێدەنگ ئەمامەوە وەک ئەمە بیست ساڵە وا بووم.
بەڵام لەبەر ئەوەی بەندکردنم بەستراوە بە ژیانی دوایی زۆر کەسەوە و بە پەیامەکانی نوورەوە کە تەفسیری~کشفکردنی تەلیسمی گەورەی بوونەوەرن، ئەوا ئەگەر من صەد سەرم هەبێ و هەر ڕۆژە سەرێکیان بپەڕێنرێت دەست بەرداری ئەم نهێنیە گەورەیە نابم.
خۆ ئەگەر لە دەستی ئێوەیش ڕزگارم ببێ هەرگیز لە چنگی مەرگ ڕزگارم نابێ.
من پیرێکی بەساڵاچووم و لە سەر ڕۆخی گۆڕ وەستام. جا سەیری ئاقە مەسەلەیەک بکەن لە نێو صەدەها مەسەلەدا کە پەیوەندییان بە نهێنیەکانی

بوونەوەرەوە هەیە، ئەوانەی کە پەیامەکانی نوور ڕوونیان دەکەنەوە و دەریان دەخەن بە پێی ئەو ئیلهامەی کە لە تەفسیری قورئانی حەکیمەوە وەری دەگرن، ئەو قورئانەی کە تەلیسمی بوونەوەرانی حەل کردووە.

سەیری ئەم مەسەلەیە بکەن کە کەس لێی ڕا ناکا، کە ئەویش مەسەلەی مەرگ و گۆڕە.

ئایا ڕێک ئەکەوێ هەموو مەسەلە سیاسییەکانی دنیا بە هەموویانەوە گرنگ تر بن بە لای مرۆڤێکی ئیمانداردەوە لە مەرگ و مردن ؟ جا چۆن ڕێک ئەکەوێ بۆ ئەم جۆرە مرۆڤە ئەم ئیمانەی بکاتە ئامێر و هۆ بۆ شتێکی تر ؟ چونکە مەرگ بۆی هەیە لە هەموو کاتێکا ملان بقرتێنێ، لە بەر ئەوەی کاتی دیاری نەکراوە جا یا ئەوەتا تیاچوونێکی هەمیشەییە یا پێناسەی گەشتێکە بۆ جیهانێکی جوان‌تر. ئەو گۆڕەی هەمیشە و هەردەم دەمی دادڕیوە و دەرگاکەی داناخرێت، یا ئەوەتا دەرگای بیری تیاچوون و چاڵی تاریکیی هەمیشەییە، یا دەرگایەکە بۆ جیهانێکی تەواوەی هەمیشەیی فراوان‌تر و ڕازاوەتر ئەکرێتەوە کە لە ناو ناچێ و تەواو نابێ.

بەم شێوەیە پەیامەکانی نوور بە بەرەکەتی قورئانی گەورە، بە دڵنیایی و بێ ئەوەی گومان هەبێ سەلماندوویانە بە مسۆگەریی حەل و چارەسەرییەک هەیە بۆ گێڕانی مەرگ و مردن لە تیاچوونی هەمیشەییەوە بۆ پێناسەی ماوەدان و بەردان، گۆڕینی گۆڕ لەو بیری تیاچوونەوە کە بنەکەی نابینرێ بۆ بەهەشتی ڕازاوە.

جا من لە پێناوی دەست‌خستنی ئەو چارەسەرییەدا هەرگیز دوودڵ نابم لە بەخت‌کردنی هەموو پایە و دەسەڵاتی دونیادا ـ ئەگەر خاوەنی بم ـ بەڵکو هەر کەسێ ژیریی ڕاستەقینەی هەبێ ئەویش هەمان کار ئەنجام دەدات ].

دوای ئەوەی تۆمەتی کارکردن لە سیاسەتی بەرپەرچ دایەوە و ڕوونی کردەوە کە تەنها بە بانگ‌کردن بۆ لای خوا لە ڕێی پەیامەکانی نووردەوە تونبەرە.

وتی: .

[ بەڵام تۆمەتی چوارەم لەو تۆمەتانەی کە بوونەتە هۆی بەندکردنم ئەمەیە کە من ڕێبازێکی صۆفیەتیی، کە لە لایەن دەوڵەتەوە یاساغە، بڵاو ئەکەمەوە.

لە وەڵامی ئەوەدا ئەڵێم: هەموو پەڕاوەکانم وان لە بەر دەستتانا و شایەتن کە هەموو بایەخێکم داوە بە دەرخستنی ڕاستییەکانی ئیمان و لە چەند پەیامێکدا باسم کردووە کە: «ئەم چەرخەی ئێستامان چەرخی تەریقەت نیە، بەڵکو چەرخی ڕزگارکردنی ئیمانە، چونکە زۆر هەن ئەچنە بەهەشتەوە بێ ئەوەی سەر بە هیچ

تەریقەتێکی صۆفیەت بن، بەلأم هیچ کەسێ بەبێ ئیمان ناچێتە بەهەشتەوە».
بۆیە ئەم چەرخەمان چەرخی کارکردنە لە پێناوی ئیماندا.
پرسیار ئەکەن: بە چی ئەژیت ؟
ئەڵێم: ناسراوە نزیکەکانم لە دانیشتوانی «بارلا» کە نزیکەی نۆ ساڵ تیایا ماومەتەوە ئەزانن خەرجی ڕۆژانەم لە صەد پارە (نزیکەی صەد فلس) تێپەری نەکردووە، هەندێ جاریش لەوە کەمتر. ئەمەش بە خێر و بەرەکەتی دەستگرتن و بە بەرەکەتی گەنجینەی قەناعەتی تەواو. هەتا خەرجی پۆشاک و پێلاوم بە درێژایی حەوت ساڵ لە حەوت لیرە تێ نەپەڕیوە.
ئینجا پەراوی ژیان‌نامەم کە لاتانە شایەتیی ئەدا من حەزم نەکردووە هیچ دیاریی و صەدەقەیەک لە خەڵکیی وەربگرم، بەڵکو دیاریی دڵسۆزترین برادەرم گێڕاوەتە دواوە و وەرم نەگرتووە، ئەگەر چی ئەوە بووبێتە مایەی دڵشکان و ئازارپێ‌گەیشتنیان، ئەگەر ناچاری وەرگرتنی دیارییەک بووبم ئەوا بژاردوومە و ناسراوانم ئەوە ئەزانن. زۆربەی ئەو مووچەیەی کە لە کاتی خزمەت‌کردنمدا لە «دار الحکمة الاسلامیة» وەرم ئەگرت لە چاپ‌کردنی ئەو کتێبانەدا کە لەو کاتەدا دام ئابوون خەرج دەکرد و بەشێکی کەمیم، بە نیازی حەج‌کردنەوە، پاشکەوت کرد و ئەو بەشە کەمە ـ بە فەڕ و پیرۆزیی دەست‌پێوەگرتن و قەناعەت ـ بەشی دە ساڵی کردم و نەی‌هێشت ئاوی ڕووم بتکێ، هەتا ئێستایش لەو سامانە پیرۆزەم لا ماوە ].
مامۆستا بە درێژە و بە دەنگێکی مەردانەوە هەموو تۆمەتەکانی ڕوون کردەوە و ڕاستیی دا بە گوێی دادگادا تا هەموو ڕاستیی‌ویستێک ئاگادار بێ و بزانێ پاگاندەکانی دەوڵەت کاتیین و تاسەر توانایان نیە لە بەردەم خۆری ئیسلامدا بە پێوە بووەستن.

## [ ٣ ] ترسێکی سەیر:

لە کاتی ئەم هەڵمەتبوونەی کاربەدەستاندا کە خەریکی پشکنینی ماڵی ئیمان داران بوون تا بەڵگەیان دەست کەوێ لە سەر تاوان‌بارکردنی قوتابیانی نوور، لە نێو پەیامەکانی نووردا پەڕاوێکیان دۆزییەوە لە سەر بەرگەکەی نووسرابوو: «هی ڕەمەزانە».
ئەم ڕەمەزان ناوە کێیە ؟ لە کوێ کار ئەکا ؟ ئەی چۆن تا ئێستە نەگیراوە، دیارە کەسێکی گرنگە بۆیە وا ناوی لە سەر یەکێ لە پەڕاوەکان نووسراوە ! کەچی وا هەموو قوتابییان دەری ئەبڕن کە نای‌ناسن، کەواتە ئەمە یەکێکە لە دۆستە نزیکەکانی سەعید نوورسیی خۆی.

کاربەدەستی نەخوێندەواری خۆهەڵواسی ڕۆژگار بە بیروهەستی هەموویانەوە بڕیارێکی توند و تیژیان دەرکرد بۆ پشکنینێکی وردی هەموو دێهاتەکان و شارە نزیکەکان، ماڵ بە ماڵ بگەڕێن بە شوێن ئەو پیاوە سامناکەدا کە ناوی ڕەمەزانە !

لە ئەنجاما لە دێیەکی زۆر دووردا پیاوێکی لادێیی سادە و ساکار و نەخوێندەواریان دۆزییەوە کە ناوی ڕەمەزان بوو.. داماوە درایە بەر و کۆت و زنجیر کرا و بە پاسەوانییەکی زۆر توندەوە خرایە بەندیخانەی «ئەسکی شەهر»ەوە، هەر چەندە داماوە چەند جار سوێندی خوارد خوێندنەوە و نووسین نازانێ و لە ژیانیا هیچ پەیامێک لە پەیامەکانی نووری نەدیوە و بە «بدیع الزمان» نەگەیشتووە، ئیتر پاڕانەوە و لالانەوە با بووەستێ، هیچیان دادیان نەدا و دوو مانگی تەخت لە بەندا مایەوە هەتا ئەوە بوو کاربەدەستێک بە وردیی سەرنجی پەڕاوەکەی دا و بۆی دەرکەوت باسی ڕۆژووی مانگی «ڕەمەزان» دەکات !

لە کۆتاییدا لە نۆزدەی ئابی ساڵی ١٩٣٥ دا بڕیاری دادگا دەرچوو بە بەندکردنی مامۆستا نوورسیی بۆ ماوەی یانزە مانگ بە تاوانی بڵاوکردنەوەی پەیامی «پۆشتەیی ئافرەتان».

## [ ٤ ] کەراماتی مامۆستا:

مامۆستا نوورسیی صەدەها کەراماتی پێوە بینراوە و دەتوانرێ نامیلکەیەکی تایبەتییان لە سەر بنووسرێ کە قوتابیەکانی و دۆست و خۆشەویستانی و هەتا دوژمنەکانی دیویانە و گێڕاویانەتەوە. بەڵام مامۆستا ئەوەندە بایەخی بەو کەراماتانە نەداوە و پێی خۆش بووە موسڵمانان بایەخ بە لایەنی ئیمانیی بدەن و سەرنجی گەوهەرە گرانبەهاکانی قورئان بدەن.

لە کاتێکا مامۆستا نوورسیی لە بەندیخانەی «ئەسکی شەهر»دا بەند بوو، بەڕێز «کمال طان» سەری لێ دا و ئەمەی نووسیی:

«قوتابیی دوا پۆلی کولیجی «حقوق» بووم، پێویست بوو سەر لە دادگا و بەندیخانەکان بدەین، بۆیە ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆ بەندیخانەی «ئەسکی شەهر» بۆ سەردان لە مامۆستا، کاتێ چوومە ژوورەوە ئەبینم لە سەر بەرماڵەکەی دانیشتووە و خەریکی ویردی دوای نوێژە، دەستیم ماچ کرد و پێم‌وت:

ـ مامۆستاگیان، دەڵێن کەراماتی غەیبیی زۆرتان لێ دەر دەکەوێ، کەچی من هیچێ لەو حاڵەتە نائاساییانەتان پێوە نابینم. جا ئەگەر ئەو حاڵەتانە ڕاستە هەن، ئەوا لەبەر چاوما دەریان خەن، بۆ نموونە با تەزبیحەکەت بڕوات بە ڕێوە..

مامۆستا زەردەخەنەیەکی کرد و ئەم چیرۆکەی - بۆ ڕوونکردنەوەی کارەکە - بۆ گێڕامەوە:

**پیاوێک کوڕێکی تاقانەی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، ڕۆژێکیان بردی بۆ دووکانی گەوهەرفرۆشێک تا هەندێ دیاریی بە نرخی ئەڵماس و گەوهەری بە گوێرەی ویستی خۆی بۆ بکڕێ. تا دەری خات زۆری خۆش ئەوێت. خاوەنی دووکانەکە، بە میزڵدانی ڕەنگا و ڕەنگی جۆرا و جۆر، بنمیچی دووکانەکەی ڕازاندبۆوە، بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کڕیاران. کاتێ منداڵەکە چووە دووکانە بە میزڵدان ڕازاوەکەوە، ڕەنگە دڵڕفێنەکان سەرنجیان ڕاکێشا و بە گریانەوە وتی:**

**- بابە ! ئەمەوێ لەم میزڵدانانەم بۆ بکڕی. میزڵدانم ئەوێ..**

**- بچکۆلە خۆشەویستەکەم گەوهەری بەنرخ و ئەڵماسی گرانبەهات بۆ ئەکڕم.**

**بەڵام منداڵەکە هەر وڕکی میزڵدانەکانی ئەگرت.**

دوای ئەوەی مامۆستا نموونەکەی تەواو کرد وتی:

**- براکەم من تەنها دەلاڵ و خزمەتگوزارێکم لە دووکانی گەوهەری قورئانی پیرۆزدا و فرۆشیاری میزڵدانی ڕەنگاو ڕەنگ نیم و، لە دووکان و بازاڕەکەمدا جگە لــــە ئەڵماسی نەمری قورئانی پیرۆز هیچی تر نیە، جــا براکەم من بە بەخشکردنی نووری قورئانەوە دەستم گیراوە.**

لە مەبەستی مامۆستا گەیشتم و هەستم بە هەڵەی خۆم کرد»(١)

---

(١) لە بەندیخانەی نسکی شەهردا و لە ساڵی ١٩٣٥ دا کەراماتی زۆر بە مامۆستاوە بینراوە لەوانە:

«مدعي عام» ئەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان مامۆستا لە بازاڕدا ئەبینێ، سەرسام ئەبێ و ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە بەڕێوەبەری بەندیخانەوە دەکا و هەڕەشەی لێ دەکا:

چۆن ڕێگاتان داوە «بدیع الزمان» دەرچێ بۆ بازاڕ، بە چاوی خۆم لە بازاڕدا بینیومە ؟ بەڕێوەبەریش وەڵامی ئەداتەوە: ببورە گەورەم، «بدیع الزمان» وا لە بەندیخانەدا و جەنابتان ئەتوانێ لە زیندانی تەنیاییدا ببینێ. دێت و پێکەوە سەر لە زیندانەکەی ئەدەن و ئەبینن وا لەوێ.

ڕووداوێکی تر کە بەڕێوەبەری ئەو کاتەی بەندیخانە «نسکی شەهر» ئەی گێڕێتەوە: دەنگی «بدیع الزمان» دێتە گوێی کە داوا ئەکا لە بەندیخانە دەرچێ بۆ بەجێهێنانی نوێژی جومعە لە «ئاق جامع». کاتی نوێژ سەر ئەدا لە بەندیخانە سەیر ئەکا «بدیع الزمان» نیە لەوێ. پاسەوانەکان لەوێن و قوفڵەکان بە دەرگاکانەوەن. بە پەلە ئەچێ بۆ مزگەوتی ناوبراو مامۆستا لە ڕیزی یەکەم و لە لای ڕاستا ئەبینێ، دوای نوێژ ئەگەڕێ نای دۆزێتەوە، خێرا ئەگەڕێتەوە بەندیخانە و ئەی بینێ «الله اکبر» ئەڵێ و ئەچێ بە سەجدەدا... هتد

# قوتابخانەی یووسفیی دووەم

[ ١ ] بەرەو «قەستەموونیی»:

دوای ئەوەی مامۆستا نوورسیی ماوەی یانزە مانگی بەندییەکەی لە «ئەسکی شەهر» بە سەر برد، ڕەهەندە کرا بۆ شاریْ «قستەموونیی» لە باکووری وڵات، ئەمەش لە بەهاری ساڵی ١٩٣٦دا. ئەوە بوو برا بۆ پۆلیس‌خانە و لەویْ سیْ مانگ مایەوە. دوای ئەوە فەرمانی بە سەرا درا لە خانوویەکی بچووکدا و هەر لەبەردەم پۆلیس‌خانەکەدا نیشتە جیْ ببیْ، هەتا بە وردیی چاودێریی بکریْ. ئەم خانووە دووقات بوو: یەکەمیان عەمباری سووتەمەنیی بوو و دووەمیان کە دوو ژوور بوو مامۆستای تیا بوو و خۆیشی کرێی ئەدا.

مامۆستا لەم شارەیشدا ماوەی حەوت ساڵ بە ڕەهەندەیی مایەوە، کە خەریکی نووسینی پەیامەکانی نوور بوو وەک: تیشکی حەوتەم «آية الكبرى» وتیشکی سـێیەم «موناجات» وتیشـکی چوارەم[١] کە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾ە و تیشکی شەشەم کە ڕاڤەی واتای «التحيات لله» یە و تیشکی هەشتەم و نۆیەم و لەگەڵ پاک‌نووسی تیشکی پێنجەم کە تایبەتییە بە باسی فیتنەی دەججاڵ لە ئاخر زەماندا.

لەم شارەدا هەر چەندە کاربەدەستان چاودێریی مامۆستایان ئەکرد، بەڵام ئەم لە چالاکیی خۆی نەئەکەوت، بڕیاری دابوو خزمەت‌کاری ئیمان بێت، دوای ئەوەی گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە هەر کەمتەرخەمییەک لە خزمەتی قورئاندا بکا ئەوا زللەیەکی میهرەبانیی لیْ ئەدریْ. بۆیە بە هەموو جۆرە ڕێگایەک نامەی بۆ قوتابییەکانی ئەنارد، هەر چەندە جاسووسی زۆری لە سەر دانرا بوو. پەیامەکانی بە نهێنیی ڕەوانە ئەکرد و دوای ئەوە لە سەریان ئەنووسرایەوە و دابەشی دیْهاتەکان و ناوچە و شارە نزیکەکان ئەکران. بەمە دەستەی دابەش کردنی پۆستە بۆ پەیامەکان بە ڕێک‌وپێکی پێک هات و ئەم‌دەست و ئەودەست بە شـــار و دیْهاتەکانا ئەگوێزرانەوە. نووســەرانیش ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادکردنا بوون، هەتا هەندیْ قوتابیی خۆیان بـە تەنیا زیاتر لـە هەزار پەیامیان نووسییەوە. ئەوە بوو شەش‌صەد هەزار دانە لە پەیامەکانی نوور بە دەســـت

---

(١) کورتەی ئەم تیشکە لە ئومێدی چواردەهەمی پەیامی پیران دا پێشکەش کراوە.

نووسرایەوە و بە هەموو ناوچەکانی وڵاتا بڵاوەیان کرد، هەر چەندە لەشکری زۆر و زەبەندەی دەوڵەتیش بە دوایانا ئەگەڕا، تا بۆ هەموان بسەلمێنرێ هەرگیز ناگونجێ و کەس ناتوانێ نووری ئیسلام بکوژێنێتەوە.

ئەم پەیامانەی لە «قەستەمۆنی» دانران لایەنی وردی عەقیدە و پەرچدانەوەی گومانی گومڕاکەرەکان لە بارەی هەندێ فەرموودەوە و بەشێکی زۆر لە فیقهی بانگەواز بۆ لای خوایان تیا بوو و لە دواییدا لە ژێر ناونیشانی «پاشکۆی قەستەموونیی» دا کۆکرانەوە.

## [ ٢ ] چاوبەستکردن:

یەکێ لە قوتابیەکانی بە ناوی «ئەمین چایەر» واتە ئەمین چایچیی[٢] لە بیرەوەریەکانیا باسی ئەو گوزەرانە تاڵەی مامۆستا نوورسیی ئەکات:

ڕۆژێکیان چاوم بە پیاوێک کەوت کە سەر و سیمای ویقار و زانایەتیی پێوە دیار بوو، بەرەو ڕووی ڕۆیشتم و دوای سەلاملێکردنی لێم پرسیی: خەڵکی کوێیت؟

وتی:

**- لێم نزیک مەکەوە پۆلیس چاودێریم دەکەن، ئەترسم بە دەستیانەوە تووشی ئازارێ ببی.**

ئەو ڕاستیی و دڵسۆزییەی کە لەم بەیەک گەیشتنەدا هەستم پێکرد بەس بوو بۆ ڕاکێشانم بۆ لای و گەڕان بە شوێنیا لە هەموو شوێنێکی شاردا، تا ئەوە بوو لە پۆلیس‌خانەدا، کە لە بازاڕدایە، دۆزیمەوە، دوای ئەوە زانییم جار جار سەر ئەکەوێت بۆ سەر قەڵای «قەستەموونیی» و پۆلیسێکیش دوای ئەکەوێ.

ڕۆژێکیان پۆلیسێک هاتە لام و بانگی کردم بۆ سەر قەڵاکە کە مامۆستا لەوێ بوو. کاتێ بە یەک گەیشتین بە پۆلیسەکەی وت:

**- براکەم، ئەم پیاوە ناسراومە، بەشکوم ماوەمان بدەی پێکەوە قسە بکەین.**

پۆلیسەکە لێمان دوورکەوتەوە. مامۆستاش دەستی کرد بە باس کردنی بارودۆخی سەخت و دژوار و ناساغیی لاشەی بە کاری ئەو ژەهرەی کە بە نهێنیی کرایە ناو خواردەمەنیەوە بۆی، دوای ئەوە وتی کە پێویستیی بە هەندێ شەکر و چایی و پێویستیی تری لەو جۆرە هەیە و وتی:

(٢) یەکێکە لەو پیاوە ناودارە کوردانەی کەخەڵکی «وان» بوو و نەفیی کرا بوو بۆ «قەستەموونیی». خەریکی چالێنان بوو، دڵسۆزیی و ڕاستگۆییەکەی چاوساغیی کرد تا مامۆستا نوورسیی بناسێ و ببێتە قوتابیی پەیامەکانی نوور، زۆربەی کاتی لە قەستەموونییدا لەگەڵ مامۆستادا بەسەر بردووە، لە بەندیخانەی «دەنیزلیی» لە گەڵیا بەند کرا. لە ساڵی ١٩٦٧ لە شاری «وان»دا کۆچی دوایی کرد..

**ـ ڕێگا نادەن هیچ کەسێ بمبینێ، جا ئەمەوێ بە موفەووەزەکە بڵێم: دڵم پێوەیە پێخەفەکەم بفرۆشم تا ئەم فرۆشتنە هۆیەک بێت بۆ بەیەکگەیشتنمان هەتا ئەم گیروگرفتە لا ئەچێ..**

دەستی کرد بە گیرفانیا و سێ لیرەی زێڕی دەرهێنا و خستنیە دەستمەوە و وتی:

**ـ ئەم لیرە زێڕانە لە پاشماوەی پارەی ڕۆژانی جەنگی جیهانیی یەکەمن، چەند ساڵێکی دوور و درێژ ئەبێ هەڵم گرتوون، بیان گرە و بە پێی پێویستیەکانم خەرجیان کە بۆم.**

پێم وت:

ـ ژیان و گوزەرانم چاکە و پێویستیم بە پارەی تۆ نیە.

وەڵامی دامەوە:

**ـ من هیچ شتێ بە بێ بەرامبەر وەر ناگرم.**

لیرە زێڕەکانیم لێ وەرگرت و یەکێکیانم لە بازاڕا گۆڕییەوە بە پارەی ئەمڕۆ. بۆ سبەینێ موفەووەزەکە بانگی کردم و وتی: ئەم مامۆستایە ئەیەوێ پێخەفەکەی بفرۆشێ، جا ئایا تۆ ئەیکریت ؟ وتم: بەڵێ.

دوای ئەوە وتی: چۆن ئەم پیاوە ئەناسی و، لە کوێ ؟ وەڵامم دایەوە: یەکێکە لە ناسراوە کۆنەکانم و یەکتریبمان زۆر ئەبینێ.

دوای دڵ پیۆە بوون، ئامادەیی خۆمم دەر خست بۆ کڕینی پێخەفەکە، پۆلیسەکە بردمی بۆ مەرکەز بۆ بینینی مامۆستا کە لە قاتی دووەمدا بوو. پێخەفەکەم بینی و دام نا بە بیست و پێنج لیرە و جارێکی تر دامەوە بە مامۆستا بە کرێ و وتم:

ـ بەو مەرجەی کرێی شەوخەوتنیم هەموو ڕۆژێ بداتێ.

بەم جۆرە بە هۆی پێخەفەکەوە هەموو ڕۆژێ ، بە بیانووی وەرگرتنی کرێکەیەوە، ئەرۆیشتم بۆ مەرکەز و هەرچی پێویستییەکی مامۆستا بوو ئەم برد بۆی ].

## [ ٣ ] ئامۆژگاریی کاریگەر:

مامۆستا لە ماڵ دەردەچوو و بە دەشت و چیا نزیکەکاندا ئەگەڕا، هەروەک زۆر جار سەر ئەکەوتە سەر قەڵای «قەستەموونیی» و لەوێ دائەنیشت بە بیرکردنەوە و سەرنجدان و خەریکبوون بە نووسین و پیاچوونەوەی پەیامەکانی نوورەوە، لە هەمان کاتا دەوڵەتیش چاودێریی هەموو هەڵس و کەوتێکی ئەکرد.

جارێکیان لە سەر دیواری قەڵاکە دانیشتبوو و پیاوێکی سەرخۆش لەوێوە بەرەو شوێنی داوێن پیسیی ـ کە لەو ڕۆژگارانەدا شوێنیان ئاشکرا بوو ـ بە لارە لار ئەڕۆیشت. گەیشتە نزیک ئەو دیوارەی کە مامۆستا لە سەری دانیشتبوو، لە شوێنی خۆیا وەستا، نە هەنگاوێ بۆ پێشەوە و نە بۆ دواوە نەئەڕۆیشت، سەیری سەرەوەی ئەکرد. سەیری مامۆستای پایەداری ئەکرد کە بەرگی سپیی پۆشیی بوو. مامۆستا ساتێک سەیری کرد و دوای زەردەخەنەیەک سەلامی لێ کرد، دوای ئەوە پێی وت:

**« براگیان بگەڕێرەوە، مەچۆ بۆ ئەوێ ! بگەڕێرەوە و خۆت بشۆ و تەوبە بکە و دەست بە نوێژ بکە ».**

دەنگی مامۆستا پڕی بوو لە خۆشەویستیی و بەزەیی، بۆیە گەیشتە ناو کرۆکی دڵی سەرخۆشەکە و ئەوەندەی زانی فرمێسک لە هەردوو چاوی بە خوڕ هاتە خوارەوە، دوای ئەوە دەستی دایە گریان و بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە. ئەو پۆلیسەی کە چاودێریی هەڵس‌وکەوتی ماموستای ئەکرد لەم ڕووداوە سەری سوڕ ئەما بۆیە بە پەلە خۆی گەیاندە تەوبەکارەکە و دەستی دایە یەخەی و قیڕاندی بە ڕوویا: خێرا پێم بڵێ، خێرا وەڵامم بدەرەوە. ئەو پیاوە کوردە چیی پێ وتی ؟!

## [ ٤ ] جل و بەرکی بێگانە:

والیەکانی «قستەموونیی» یەک لە دوای یەک دژایەتیەکی زۆریان لەگەڵ مامۆستا ئەکرد و بەتوندیی چاودێرییان ئەکرد، بە تایبەتیی «عەونی دۆغان» و «مەدحەت ئالتی ئاوق» لە هەموویان خراپتر بوون و هەمیشە بە بیانووبوون بۆ ئازاردانی.

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٥دا یاسای گۆڕینی جل‌وبەرگ لە لایەن دەوڵەتەوە دەرچوو و بەو پێیە جل و بەرگی عوثمانیی بۆ پیاوان و بەرگی حەیای ئافرەتان قەدەغە کرا و، ڕووتیی بۆ ئافرەتان و بەرگی ئەورووپا و لە سەر کردنی شەبقە بۆ پیاوان سەپێنرا.

مامۆستا نوورسیی هێشـــتا جل و بەرگ و مێزەری زانایانی کوردەواریی لانەبردبوو، بۆیە مەدحەت پاشای والیی شار بانگی کرد بۆ لێ پرسینەوەی.

کومەڵێ پۆلیس دەوری ماموستایان گرتبوو و گەیشتە لای والیی، بەڵام زۆر تووڕە بوو، وا دیار بوو یەکێ لە پۆلیسەکان هەر لە ڕێگادا هەوڵی دابوو مێزەرەکەی لـــە ســـەر داگرێ. بۆیە کـــە چووە ژوورەوە لای والیی بـــە توندیی پێی وت:

**- گوێ بگرە مەدحەت ! تەنها پەردەیەکی تەنک هەیە لە نێوان ئێمە و ئەو مەرگەدا کە ئێوە لێی ئەترسن، جا ئەگەر ئەو پەردەیەمان دڕاند ئیتر شتێ نامێنێت ئێمە لێی بترسین. خۆ ئەگەر ملپێچییەکی یاسایی هەیە ئەوا یاسامان بە سەرا جێ بەجێ بکە و چیت پێ خۆشە وا بکە.**

لە مردن بەو لاوە هیچی تریان لە دەست نایەت، خواناسانیش ئەوەندە دڵ بەم دنیایە خۆش ناکەن تا لە مردن بترسن، ئەوانەشمان کە وانین ئەوە نرخی زیاتر بۆ دنیا دا ئەنێین و قیامەتمان بە لاوە ئاسانە.

والیی ڕەنگی زەرد بوو.. تێک چوو.. زمانی گۆی نەئەکرد.. بە نارەحەتیەکی زۆرەوە پەنجە لەرزۆکەکانی گەیاندە زەنگی سەر مێزەکەی.. دەستی پیا نا تا یەکێ لە پیاوەکانی بێن و «بدیع الزمان» بەرنەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. ئیتر ئەم والییە کە بە دڵڕەقیی و زمان پیسیی، بەناوبانگ بوو، نەی توانی دەم بکاتەوە و بە مامۆستا ڕابگەیەنێ کە جل و بەرگەکەی بگۆڕێ..

[ ٥ ] پشکنین:

پەیـامەکانی نـوور ڕۆژ بـە ڕۆژ دڵـەکانیــان بێـدار ئەکردەوە .. موسڵمانان لەوپەڕی چالاکییدا ئەژیان بە تایبەتیی دوای دەرکەوتنی بەڵێن و دروشمی نیشتمانپەروەریی و نەتەوایەتیی و، دوای ئەوەی ئەو دەستە و تاقمەی دژی ئیسلام بوون دەرکەوتن چەندە لە ڕاستیەوە دوورن و هەرچیان وت وا دەرنەچوو، گەنجەکان ئەگەڕانەوە بۆ سەر ئیمان و دڵەکانیان بە نووری قورئان ڕۆشن ئەبوویەوە.

لە هەمان کاتا دەوڵەتیش هەموو نەخشەیەکی، بۆ وەستاندنی چالاکی قوتابیانی نوور تاقی کردەوە، تا لەوە زیاتر بڵاوە نەکەن و دەنگیان نەگاتە شار و دێهاتەکان. بەڵام بێهوودە بوو، بۆیە بە ناچاری پەنای بردەوە بەر کوتەک و بەند و دادگا.. تا نەهێڵێ موسڵمانی بەوەفا و پاک و بێگەردی خزمەتگوزار لە خاکی خۆیا خواپەرستیی بکا..

کاربەدەستان هەروا لە سەر تەنگ هەڵچنین بە مامۆستا و قوتابیەکانی نوور بەردەوام بوون، ئەوەتا بەڕێز ئەمین چایچیی ئەڵێ:

پەیامەکانی نوور و نامەی ئاساییمان لە عەمباری دار و لە ژێر سووتەمەنییدا ئەشاردنەوە. جارێکیان توانیان دەست بگرن بە سەر ئەو نامانەدا کە بۆ مامۆستا هاتبوون. دایان بە سەر ماڵدا و پشکنینێکی وردیان کرد بە ڕادەیەک بـەرگی کاتژمێرەکەیان (کاتژمێری دیوار) کردەوە و سەیری

ناوەکەیان کرد. دوای ئەوە من و «بەحریی» برام و موحەممەد فەوزییان برد بۆ پاسگای پۆلیس و لەوێ تەنگیان پێ هەڵ چنیین و پێیان وتین:

« ئێوە کۆمەڵەیەکی نهێنیتان پێک: هێناوە پێمان بڵێن پەیوەندیی بە کێوە ئەکەن ؟ »

دوای ئەوە هەر یەکە لە ژوورێکی جیادا بەندیان کردین.. موحەممەد فەوزیی بە بەڕێوەبەری پاسگای وت:

- بەڕێوەبەری بەڕێز !... مەبەستی پەیامەکانی نوور ڕوونکردنەوەی ڕاستیەکانی ئاخیرەتە و، گرنگیی نادەن بە کاروباری دنیا و، ئەگەر بتەوێ هەندێ بڕگەتان بۆ ئەخوێنمەوە.

ئەوە بوو دەستی کرد بە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور، لە بارەی ڕاستییەکانی ئیمان و ڕاستییەکانی قورئانەوە.

بەڕێوەبەریش ماوەیەک گوێی بۆ گرت و دوای ئەوە بە توندییەوە بێدەنگی کرد و پێ وت: بیری منیش ژەهراویی ئەکەن.. بێدەنگ بە.

لە کاتی پشکنینی ماڵەکانمانا هەندێ پارەیان لە سندوقێکی ماڵەکەی منا دۆزییەوە، گرنگییەکی گەورەیان دا بە مەسەلەی ئەو پارەیە و زۆرێ تەنگیان پێمان هەڵچنی لە سەری، بە تایبەتی «عونی دۆغان» ی والیی کە پرسیاری لێ ئەکردین:

«ئـــەم پارەتان لـــە کوێ بوو ؟ بـێگومان ئـــەم پارەیە پارەی کۆمەڵە نهێنییەکەیە». پێم وت:

« کاتێ لە شارەکەمەوە هاتم بۆ ئێرە، ئەم پارەیەم هەبوو، من لێپرسراوی بەخێوکردنی نزیکەی پانزە کەسم، بێگومان ئەم ژمارەیە پێویستیی بە دوو هەزار لیرە هەیە، دوای ئەوەش ئەتوانن لـــە بارەی داراییمەوە پرســـیار لە فەرمانداری شارەکەم (ئاهلت) بکەن».

لە کاتێکا کە مامۆستا بە بۆنەی ژەهرپێدانەوە لە ماڵەوە کەوتبوو و تایەکی زۆری هەبوو، لە (٣١)ی ئابی ١٩٤٣دا پۆلیس دایان بە سەر ماڵەکەیا و ئەم دیو و ئەو دیوێکی خانووەکەیان کرد بێ ئەوەی هیچیان تیایا دەست کەوێ جگە لە هەندێ لە پەیامەکانی خوور کە لە بارەی ئیمان و قیامەت و ڕەوشتی موسڵمانەوە و... هتد باس ئەکەن.

جارێکی تریش لە (١٨)ی ئەیلوولی هەمان ساڵدا دایانەوە بە سەریا و دەســـتیان کردەوە بە پشـــکنین بـــە هیوای دەســـتکەوتنی بەڵگەیەک بـــۆ تاوانبارکردنی. جا هەر چەندە جگە لە پەیامەکانی خۆی هیچی تریان دەست

نەکەوت، لەگەڵ ئەمەشا (٢٠٠)ی مانگ بەندیان کرد و لەگەڵ صەد و بیست و شەش قوتابیی نووردا، کە لە شارە جۆر بە جۆرەکانەوە کۆکرابوونەوە، لە ژێر چاودێریی پۆلیس دا، ڕەوانەی «ئەنقەرە» کران..

ئەمجارەش، وەک جارانی تر، چەند تاوانێکیان بە نارەوا درابوویە پاڵ، وەک پێکهێنانی کومەڵەیەکی نهێنیی و هەڵنانی گەل دژی دەوڵەتی بە ناو عیلمانیی و هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی، دوای ئەوە ناوبردنی موصطەفا کەمال بە دەججال و ڕووخێنەری ئایین !.

## [ ٦ ] سەفەری ڕەمەزان:

دوای بە سەر بردنی حەوت ساڵ لە شاری قەستەموونییدا و، دوای ڕژانی خێر و بەرەکەت بۆ ماوەی حەوت ساڵ بە سەریا، مامۆستای خواناس لە مانگی خواناسییدا، مانگی ڕەمەزان، حەواڵەی پایتەخت کرا.

لە ئاخر و ئۆخری مانگی ڕەمەزاندا و لە ڕۆژێکی گەرمدا مامۆستای پیری بە ساڵا چوو، سواری ئوتومبێلێکی گشتیی نەفەرگواستنەوە کرا. لەم کاتەشدا هێشتا ئەرکی سەرشانی خۆی لە یاد نەچوو، ئەرکی تێگەیاندنی موسڵمانان و ئاگادار کردنیان لە ئایین.

ئەوەتا بەڕێز «ضیاء دیلەک» لە بیرەوەرییەکانیدا باسی گواستنەوەی مامۆستا ئەکا کە ئەڵێ:

( سواری ئوتومبێلی پاص بووم تا بگەمە سەر کارەکەم لە شاری «ئیلگاز» لە «ئولوک باش» لە لایەن پۆلیس و ژاندرمەوە ئوتومبێلەکە وەستێنرا و سێ کورسییان لە دواوە بۆ مامۆستا نوورسیی تەرخان کرد.

کاتێ ئوتومبێلەکە کەوتە ڕێ تەندروستیی تێک چوو، ئەو کاتە پیرێ بوو لە تەمەنی حەفتا ساڵییدا، کاتێ کە مامۆســــتا سوار بوو وتی: «ئەوان کە بە تاوانبارێکی سیاسییم دا ئەنێن، پێویست بوو لە سەریان بۆ گواستنەوەم، ئوتومبێلێکی تاکسییم بۆ تەرخان کەن»، ئەو سەربازەی لە تەنیشتما دانیشتبوو لە شوێنەکەی هەڵسا و بە مامۆستای وت: «فەرموو مامۆستا گیان لە جێگاکەی من دانیشە».

بەم شێوەیە جێ گۆڕکێ لە نێوان سەربازەکە و نێوان مامۆستادا کرا.. من ترسم لێ نیشتبوو بۆیە نەم ئەتوانی گرنگیی بە مامۆستا نوورسیی بدەم، یا دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کەم.

کاتێ لە تەنیشتما دانیشت پرسیاری ناومی لێ کردم، کە پێم وت ناوم «ضیاء دیلەک»ە، وتی:

**« ئایا تۆ ضیائی دۆستمانی ؟ ئایا بۆ ئەوە هاتوویت بە ناوی دانیشتوانی قستەموونیی‌یەوە خواحافیزییمان لێ بکەیت ؟»**

دوای ئەوە ئاوڕی دایەوە بۆ لای صەفوەتی سەرباز کە پاسەوانیی ئەمی خرابووە ئەستۆ و لە دوایەوە دانیشتبوو و پێی وت:

**« صەفوەت ! کاتێ داتان بە سـەر مالْدا چ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بوو ئەمخوێند ؟».**

دوای ئەوە داوای کاغەزێکی کرد و ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە تا بی‌نووسم، دوای ئەوە کاغەزەکەی پێشکەش بە صەفوەت کرد و ئەو ئایەتەی پیشان دا کە ئەمە بوو:

﴿ واصبر لحكم ربّك فإنك بأعيننا وسبّح بحمد ربك حين تقوم * ومن الليلِ فسبّحه وإدبار النجوم ﴾ (الطور: ٤٥-٤٦)

دوای ئەوە ئاوڕی دایەوە بۆ لام و وتی[٣]:

**« ضیاء ! مژدە بدە بە دۆستەکانت و پێیان بلێ با دلْیان هیچ نەکا، هیچ بڕیارێ دژمان دەرناچێ کە تاوانبارمان کات، یا هودنەیە یا ڕێک‌کەوتن ».**

مامۆستا سەلام و هەندێ دەنگ و باسی بە منا ئەنارد بۆ ئەو دۆستانەی کە دەست بە سەر، یا بەند کرا بوون، هەر چەندە من هێشتا نە دەست بە سەر و، نە بەند کرا بووم !

دوای ئەوە وتی:

**« هیوادارم داوا بکەن لە شۆفێری بەڕێز - ئەگەر ڕازییە - ئوتومبێلەکە بوەستێنێ، چونکە لە ئاییندا زۆرکاریی نیە، هەندێ ئامۆژگارییم لایە بۆ برا هاوسەفەرەکان ».**

شۆفێر ئوتومبێلی وەستان و مامۆستاش ئاوڕی دایەوە بۆ لای دانیشتوانی ناو ئوتومبێلەکە و وتی:

**« ئەمشەو ئیحتیمالی زۆرە شەوی قەدر بێت، پاداشتی خوێندنی قورئان لە ڕۆژانی ئاساییدا دە چاکەیە بۆ هەر پیتێک و، لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا پاداشت هەزار چاکەیە، بەلاّم لە شەوی قەدردا پاداشت سیی هەزار چاکەیە. ئەگەر پێتان بلْێم پێنج لیرەی زێڕتان دەست ئەکەوێ ئەگەر فلاّنە کار بکەن، ئایا ئێوە حەز ئەکەن ئەو لیرانەتان دەست کەوێ؟».**

ئەفەرەکان وەلاّمیان دایەوە: بەلْێ.. حەزمان لێیەتی. پێی وتن:

(٣) کاغەزی ئایەتەکەشی نەداتێ.

**« ئێوه درێغیی ناکەن لە سەرف کردنی هەموو توانا و هەموو هێزێکتان‌دا بۆ دەست‌خستنی پێنج لیرەی زێڕ لەم دنیا بەفەناچووەدا، دەی ئایا حەز ناکەن هەندێ توێشوو هەڵ گرن بۆ ژیانی هەمیشەیی و نەمریتان ؟ ».**

کاتێ نەفەرەکان وەڵامیان دایەوە: بەڵێ حەزمان لێیەتی. بدیع الزمان پێی وتن:

**« کەواتە، ئەگەر هەموو موسڵمانێ لێرە سێ جار سوورەتی «إخلاص» و سوورەتی «فاتحة» و«آية الكرسي» بخوێنێ ئەوا هەندێ توێشووی بۆ ژیانی هەمیشەیی پاشەکەوت کردووە ».**

شۆفێرەکە و نەفەرەکان وتیان: خوا لێت ڕازیی بێت مامۆستا گیان. دوای کەمێ کاتـی ڕۆژوو شـــکاندن هـات و ئوتومبێلەکە لەبەردەم کانیاوێکی سەوزەلانەکانی ئیلگازدا، کە بە جوانیی و ڕازاوەیی بەناوبانگن، وەستا بۆ خواردنی نانی ئێوارە، لەوێ ئەو خواردنەی کە شارەوانیی ناردبووی بۆ مامۆستا لەگەڵ ئەو خواردنەی کە پێم بوو گۆڕیمانەوە.. بەربانگمان کردەوە و لەوێ ماینەوە هەتا خەوتنان و نوێژمان پێکەوە کرد، ئیتر لەوێ لە مامۆستا جیا بوومەوە، بەرەو کارەکەم ڕۆیشتم، بەڵام دوای ماوەیەک منیشیان گرت و بردمیان بۆ دەنیزلیی. کاتێ گەیشتمە دەنیزلیی هێشتا مامۆستایان بۆ نەهێنا بوو.

لە بەندی‌خانەی دەنیزلییدا بە گەرمیەوە دۆستان لێیان ئەپرسیم:

ئایا مامۆستات بینی ؟

ئەو کاتە ئەو ئایەتەم هاتەوە یاد کە مامۆستا لە ڕێگای ئیلگازدا و لە ناو ئوتومبێلەکەدا بۆی خوێندمەوە تا بی‌نووسم، لە گیرفانما دەرم‌هێنا و بۆم خوێندنەوە، دوای ئەوە ئەوەی لە ڕێگادا ڕووی دا بۆم گێڕانەوە. دۆستان بە بیستنی ئەمە مژدەیان وەرگرت و زۆرێ شادمان بوون و دەروونیان حەسایەوە ).

مامۆستا گەیشتە ئەنقەرە و لە ئوتێلێکدا دابەزی و بڕیار وا بوو دوای چاوپێ‌کەوتنی والیی ئەنقەرە لە سەر گەشتەکەی بەردەوام بێت.

« صلاح الدیـن چلبي »، کە یەکێکە لە قوتابیانی نوور و بەر ئەو بەندکردنەی ئەنقەرەش کەوتووە، باسی ئەو کاتە ئەکات:

( ... لەم کاتانەدا ڕەئیس عورەفا ناجی هات و بە هەڵ چوونێکەوە، وەک هەواڵێکی ناخۆشیی گەورە بڵاو بکاتەوە، وتی:

مامۆسـتا «بدیع الزمان» یان لە قەستەموونییەوە هێناوە و ئەمشەوی لە ئوتێلێکی ناوچەی «جانقری قاپی» بە سەر بردووە، جا خزمەت گوزارانی

ئوتێلەکەیان گۆڕیوە بە پۆلیس، هەروەها پۆلیسێکیان لە بەرگی شاگردا خستۆتە خزمەتیەوە.

دوای کەمێک بانگیان کردم بۆ ژووری بەڕێوەبەری لقی یەکەم.. چوومە ژوورەوە.. مامۆستا دانیشتبوو، چەمیمەوە بە سەر دەستیا و ماچم کرد.. دەستی گەرم بوو، دەستیم لە دەستما هێشتەوە و زۆریش نەخۆش و ماندوو بوو، لەگەڵ ئەوەشا ڕووی وتاری کردە بەڕێوەبەر و وتی:

**« ئەمانە ڕۆڵەی ئیماندار و قوربانیی‌دەرن بۆ ئەم نیشتمانە. هەرگیز ناگونجێ ئاسایش تێک بدەن، بە پێچەوانەوە ئەمان پارێزگاریی ئەمن و ئاسایش ئەکەن ».**

دوای ئەوە ئاوڕی دایەوە بۆ لام و وتی:

**« نەترسیت ».**

## [٧] دیسان یاسای جل‌وبەرگ:

والیی ئەو کاتەی ئەنقەرە «نەوزاد طان دۆغان» بوو، کە بیستی وا مامۆستا گەیشتووە خێرا ناردی بە شوێنیا.. زۆری لە بارەوە بیستبوو.. ئەم پیاوە چۆن پیاوێکە لە مالا دەر ناچێ کەچی وا دەوڵەت بە دەستیەوە گیری خواردووە ؟ جاسووسی لە سەر دائەنێ، کەچی ڕۆژ بە ڕۆژ کاریگەریی بیروباوەڕەکەی ئەگاتە سەرانسەری تورکیا ؟

ئـەم پیاوە چۆن ئەتوانێ دژی بڕیاری دەوڵەت بوەســـتێ و جل و بەرگی نەگۆڕێ؟

ئەبێ هەر چۆنی کردووە جل و بەرگی بگۆڕی. کێ ئەتوانێ دژی بڕیاری دەوڵەت بوەستێ ؟

پاســـەوان دەوری مامۆســـتایان دابوو بردیانە بارەگای والیـی و چووە ژوورەوە لای.

صلاح الدین چەلەبی ئەڵێ:

ڕۆژێکی زۆر گەرمی ڕۆژەکانی کوتایی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بوو، بە ڕۆژوو بووم و لـــە بەر دەرگای ژوورەکەی والیـــی نـــەوزادا وەســـتا بووم. کاربەدەستان مامۆستا «بدیع الزمان»یان هێنا و بردیانە ژوورەکەی والیی و خۆشیان لەگەڵیا چوونە ژوورەوە، دوای کەمێک کاربەدەستەکان هاتنە دەرەوە و دەرگا داخرا، دەنگی بەرزی پڕ تووڕەیی لە ژوورەکەوە دەرئەچوو، دوای ئەوە دەنگی زەنگێک بەرز بۆوە و دەرگەوان چووە ژوورەوە دوای ماوەیەک هاتە

دەرەوە. لەم کاتەدا «بدیع الزمان» بە توند و تیژییەوە لەگەڵ والییدا قسەی ئەکرد و ئەی وت:

**« من لە جێی باو باپیرانتانم، من بە گۆشەگیریی ئەژیم، لە بەر ئەمە یاسای «بەرگ و بالا» بە سەر ئەو کەســـانەدا جێ بەجێ ناکرێ کە بە گۆشەگیریی ئەژین. من دەر ناچمە دەرەوە، بەڵکو ئێوە ناچاری دەرچوونم ئەکەن... دەی خوا بدا بە تەوقی سەرتا »[٤].**

لەم کاتەدا دەرگەوان گەڕایەوە شەبقەیەکی بێ نرخی بە دەستەوە بوو و چۆوە ژوورەکەی والیی[٥].

دوای ئەوە چەند کاربەدەستێک لە قاتی سەرەوە هاتن و هەندێ نووسراویان دا بە دەست پۆلیسەکانەوە. دوای ئەوە «بدیع الزمان» هاتە دەرەوە و ئەی‌وت:

**« مەترسە ئەی صلاح الدین... مەترسە... مەترسە... بە خوات ئەسپێرم ».**

چەند پۆلیسێک دەوریان گرتبوو. بە پێی ڕیوایەتی بەڕێز «زبیر کوندوزالب» «بدیع الزمان» ڕووی وتاری کردۆتە والیی «نەوزاد طان دوّغان» و پێی وتووە:

**« ئەم مێزەرەیە دا ناکەنرێ مەگەر بە لێ‌کردنەوەی سەرم ».**

کەی مرۆڤ ئاوا تاوانبار ئەکرێت ؟!

یا کەی ئەمە تاوانە، مرۆڤ بیەوێ چ پۆشاکێ بپۆشێت ؟!

## [٨] بەندیخانەی «دەنیزلیی»:

مامۆستا لە «ئەنقەرە» وە نێررا بۆ «ئیسپارتە» و لەوێشەوە بۆ «دەنیزلیی» و خرایە بەندیخانەکەیەوە، کە مامۆستا خۆی ناوی نا قوتابخانەی یووسفیی دووەم.

هەر کە مامۆستایان گەیاندە بەندیخانە لە بەردەم ئاودەستی بەندیخانەدا شوێنێکیان بۆ دیاریی کرد کە ئەوە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ جێی حەوانەوە و خەوتنی بوو دوای ئەوە لە هۆڵێکی گەورەی شێ‌دار و هەواپیس‌دا بەندیان کرد.

لەگەڵ مامۆستادا (١٢٦) قوتابیی نووریش لە «دەنیزلیی» بەندکران. بەندیخانەکەش بریتیی بوو لە بینایەکی تەڕی شێ‌دار و خراپ‌ترین شوێنی بۆ

(٤) ئەم والییە دڵ ڕەقە بە مردنی ئاسایی نەمرد، بەڵکو لە (٩)ی تەمووزی (١٩٤٦) دا گوللەیەکی نا بە تەوقسەری خۆیەوە و خۆی کوشت. شایانی‌باسە بە شێوەی گشتیی مامۆستا نوورسیی نزای لە دەوڵەت و کاربەدەستانی تورکیا نەکردووە ئەگەر چی ماوەی سیی و پێنج ساڵ نەیان هێشت پشوویەک بدات.

(٥) وا دەر ئەکەوێ والیی ئەیەوێ بەم شەبقەیە مامۆستا ناچاری جل گۆڕین بکات.

قوتابیانی نوور تەرخان کرا. بەلام دوو کار بووبوونە مایەی دڵخۆشیی بۆیان، یەکەم: دەیانزانی مامۆستا لێیانەوە نزیکە، دووەمیش: لە بەندیخانەدا یەکتریان دەناسی و برایەتیی و خۆشەویستییان پتەوتر دەبوو. ئەوەندەی پێ نەچوو پۆستەی نهێنیی قوتابیان لە سەر پارچە کاغەزێکی بچووک و لە نێو پاکەتە شقارتەدا پێی گەیاندن کە مامۆستا سەلام و بەخێرهاتنیان لێ دەکات، ئەم سەلامە فێنکیی خستە دڵیانەوە و ئارامیی پێ بەخشین..

کاربەدەستان ئاگاداری بەندییە تاوانبارەکانیان کرد کە وت و وێژ لەگەڵ قوتابیانی نوور، بە تایبەتیی مامۆستادا، نەکەن، چونکە ئەمانە کومەڵێکن لە بیروباوەڕی خۆیان لایان داوە!

ئەوەندەی پێ نەچوو دیاردەیەکی سەیر دەهاتە پێش چاویان.. خراپترین تاوانبار، کە پاسەوانانی بەندیخانە لێیان دەترسان، ڕێگای خواناسییان دەگرتە بەر و لەگەڵ قوتابیاندا دەستیان بە نوێژ دەکرد.

هەتا دوای بێتاواندەرچوونی قوتابیانی نوور، دیمەنێکی کاریگەر دەبینرا، چونکە تەوبەکارەکان ماوەیەکی دوور و درێژ حوکمیان لە سەر بوو، بۆیە لە بەر پێناخۆشبوونی جیابوونەوەیان فرمێسک لە چاوەکانیان بە خوڕ دەهاتە خوارەوە و دەیان وت:

*« ئێمە نە خوا و نە پێغەمبەرمان نەدەناسی، ئێوە ڕێگای ڕاستتان پیشان داین، جا ئێمە هەرچی بکەین ئەوا ناتوانین نەپاداشتی چاکەی مامۆستا نوورسیی و، نە پاداشتی چاکەی ئێوە بدەینەوە ».*

ئەوە بوو قوتابیان و مامۆستا هەموویان لەو بەندیخانەیە ڕزگاریان بوو جگە لە «حافظ علي ئەرکون» ی شەهید کە بەو ژەهرە کۆچی دوایی کرد کە کرابوویە ناو خواردنەوە بۆ مامۆستا و قوتابیانی نوور(٦).

تەوبەکارەکان زۆر دڵتەنگ بوون : قوتابیانی قورئان دەر دەچن و ئەمان ساڵەهای ساڵ لە بەندیخانەدا بە تەنیا دەمێننەوە. بۆیە مامۆستاش مژدەی بۆ ناردن:

**«دووڵ و خەمبار مەبن.. حکومەتێکی نوێ دێتە سەر حوکم و عەفووی گشتیی دەر دەکا و ئەو کاتە، بە ویستی خوا، دەردەچن».**

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٠ دا پارتی دیموکراتیی دەسەلاتی گرتە دەست و بەندکراوانی ئازاد کرد.

---

(٦) سەیری پەیامی پیران ل ١٣٧-١٤٠ بکە، تا کەمێ لە خواناسیی ئەم شەهیدە ئاگادار بیت.

بۆ ڕۆژانی مەحکەمە دەستی مامۆستا نوورسیی لەگەڵ دەستی قوتابیەکی نووردا کۆتیان تێ دەخرا و، لە پێشی کاروانێکەوە، کە ڕیزەکەی دەگەیشتە حەفتا کەس، دەیان خستە ڕێ و، کۆمەڵێ سەربازی چەکدار دەوریان دەدان و، لە بەندیخانەوە و، لە دەرەوەی شارەوە و، لە گۆڕستانێکی کۆنەوە بۆ دادگا دەبران.. مامۆستا لە نزیک گۆڕستانەکەدا دەوەستا و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و قوتابیەکانیش لە دوایەوە هەموو دەستیان بەرز دەکردەوە و لە خوا دەپاڕانەوە تا چاوپۆشیی لە مردووانی ئەو گۆڕستانە بکا.

پاڕانەوە بو مردووان ! وەک لە سەر خاکی تورکیادا، بگرە لە سەرزەوییدا، هیچ ناڕەواییەک نەبێت.. پاڕانەوە لە خوا تا لە مردووان خۆش بێت. ئەمە وانەیەکی گەورەی تیایە بۆ ئادەمیزادی ژیر و وریا، چونکە ڕزگاریی قیامەت بنەڕەتە و، مەبەستی گەورەی موسڵمان ڕزگاریی ئەم دونیا نیە !!

ئەم کاروانە خواناسە دەیدا بە ناو شاردا و بە دەستی پڕ لە کۆت و زنجیرەوە ڕێی دادگای دەگرتەبەر، دانیشتوانی شاریش، بە پیاو و ئافرەت و منالەوە، ئەم بەر و ئەوبەری شەقامیان دەگرت و، ئەم دیمەنە پڕ ئازارەیان دەبینی، بەلام دەسەلاتیان چیە ؟ تەنها ئەوەندەیان دەتوانی بە دەست سەلامیان لێ بکەن کە وا لەم ڕۆژە سەختە ناهەموارەدا بوونەتە هەڵگری ئیمان و، کوفر و ئیلحاد ناتوانێ بیانبەزێنێ.. دەبا هەر سەربەرز بێ ئەو موسڵمانەی کە کافران لە سەر ئیمان دژایەتیی لە گەلا دەکەن.

﴿ وما نقموا منهم إلاَّ أن يؤمنوا بالله العزيز الحميد ﴾ (البروج: ٨)

## [ ٩ ] لیژنەی سەرنجدان و لێکۆڵینەوە:

لەم کاتانەدا دەوڵەت لە کۆمەڵێ نیمچە خوێندەوار لیژنەیەکی پێک هێنا بۆ سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی پەیامەکانی نوور، تا ڕای خۆیان دەربڕن ئایا هیچ شتێکی یاساغی قانوونیان تیایە یان نا و، بۆ ئەمە هەرچی پەیامێکی نوور ئەو کاتە ئامادە بوو پێشکەش بەم لیژنەیە کرا.

مامۆستا نوورسیی کە ئەم هەواڵەی بیست، ناڕەزایی خۆی دەربڕیی کە ئەولیژنەیە ئەوەندە خوێندەوار نین تا بتوانن ڕای خۆیان بە ڕاستیی و تەواویی لە سەر پەیامەکانی نوور دەر بڕن، داوای کرد یا لیژنەیەکی زانستیانەی بالا لە پسپۆڕانی ئەنقەرە پێک بێنن، یا با فەیلەسووفانی ئەورووپا بانگ کەن، جا ئەگەر ئەو کاتە لە پەیامەکانی نووردا تاوانێک یا ملپێچییەکی قانوونییان دۆزییەوە، ئەوا ڕازییە بە سەختترین سزا..

دەوڵەت ئەم داوایەی بیست و لیژنەیەکی باڵا لە ئەنقەرەی پایتەخت پێک هێنرا، کە زانا و شارەزا و پسپۆڕی گەورە گەورە بەشداربیان تیا کرد و، دەستیان دایە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی پەیامەکانی نوور و ئەو نامانەی کە مامۆستا ناردبوونی بۆ قوتابیەکانی، ئنجا ڕاپۆرتی داواکراویان خستە بەر دەستی دەوڵەت کە ئەمەی تیا نووسرا بوو:

*«بدیع الزمان نوورسیی هیچ کار و چالاکییەکی سیاسیی نیە و، داوای پێک هێنانی هیچ کۆمەڵەیەکێ سیاسیی و تەریقەتێکی سۆفیگەریی ناکات و، دانراوەکانی هەر هەموویان ئیمانیی و زانستیی و تەفسیری قورئانی پیرۆزن».*

ئەم ڕاپۆرتە درا بە دادگا و مامۆستاش ـ چونکە هیچ پارێزەرێک لەوێ نەبوو بەرگریی لێ بکا ـ خۆی شێرانە و ژیرانە بەرگریی لە خۆی و پەیامەکانی و قوتابیەکانی کرد و، دادگای ناچار کرد بە یەکدەنگیی (إجماع) دان بەبێ تاوانییانا بنێ و لە ١٩٤٤/٦/١٦ دا بڕیاری بێ‌تاوانییان دەرچوو. دادگای تەمییزیش لە ١٩٤٤/١٢/٣. دا دیسان بە یەکدەنگیی دانی پیا نا و پەیامەکان درانەوە بە خاوەنەکانیان.

مامۆستا و هەندێ لە قوتابیەکانی نۆ مانگ لە بەندیخانەی «دەنیزلیی» مانەوە و لەوێش هەوڵێکی تر درا بۆ ژەهر پێدانی بەڵام خوای گەورە ڕزگاری کرد، هەر چەندە بە دەست ئێش و ئازاریەوە دەتلایەوە، زیاد لەو سزا و ئازار و سووک سەیرکردنەی کە بەرامبەری دەکرا لە تەمەنی حەفتا ساڵییدا..

## [ ١٠ ] بەرهەمی ئەم بەندیخانەیە:

لەم بەندیخانەیەدا مامۆستا پەیامی میوە «بەری درەختی ئیمان»ی نووسیی، کە بریتیە لە کورتەیەکی خەست و خۆڵی مانا و مەبەستەکانی پەیامی نوور. جا لە بەر ئەوەی ئەم پەیامە بەرگریی لە ئیمان دەکا، ئەوا وەک وەثیقەیەکی بەرگریی خرایە بەردەم دادگا تا دەوری خۆی ببینێ.

ئەم پەیامە بە ڕاستیی میوەیەکی پڕ تام و لەزەتی درەختی ئیمان بوو و لەو بەندیخانەیەدا هاتەبەر.

وا مامۆستا خۆی باسی کاریگەریی ئەم پەیامە دەکات بۆ چارەسەریی دڵەکان کە بەرهەمی خواپەرستیی ئەو بەندیخانەیە بوو:

**« بەندیخانەی «دەنیزلیی» ڕاشترین شایەتیی ئەم قسەیەیە، ئەوە بوو هەر کە قوتابیانی نوور و پەیامی «میوە» چوونە ئەوێ، پتر لە دووسەد بەندکراو تۆبەیان کرد و ڕێگای ئایین و چاکە و گوێڕایەڵیی فەرزەکانی خوایان گرتەبەر.**

**ئەوەش لە ماوەی سێ مانگ یان شتێک زیاتردا ڕووی دا. بە ڕادەیەک یەکێک لەوانە کە سێ کەس زیاتری کوشتبوو، وای لێ هات دەستی لە کوشتنی ئەسپێ و کرمی دار دەگێڕایەوە ! نەک بوو بە ئەندامێکی بێزیان و بەس، بەڵکو لەوە زیاتریش بوو بە ئەندامێکی سوودبەخشی بەبەزەیی لە وڵاتا.**

**ئەوە بوو فەرمانبەرە لێپرسراوەکان بە سەرسامیی و سەرسوڕمانەوە سەیری ئەم باروودۆخەیان دەکرد، هەتا هەندێ لە لاوان، بەر لەوەی بڕیاری دادگا دەر بچێت، دەریان بڕیی: ئەگەر قوتابیانی نوور لە بەندیخانە بێننەوە، ئەوا خۆمان توهمەتبار دەکەین تـــا حوکم بـدرێین و لـــە گەڵیانا بێنینەوە و بـــە ئامۆژگاریەکانیان خۆمان چاک کەین و ببینە قوتابییان و وەک ئەوانمان لێ بێت».**

بەڵێ بەندکرانی خزمەتگوزارانی قورئان لە «دەنیزلیی» بووە مایەی قازانجێکی زۆر و وانە و ورەیەکی زۆریان دەست کەوت. ئەوەتا مامۆستا خۆی باسێکی باری قوتابیانمان لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا بۆ دەکا:

**«دوای ئەوە ڕەوانەی دەنیزلیبیان کردین و منیان خستە ناو هۆڵێکی گەورەی زۆر ناخۆش و شێدارەوە، زیاد لەوەی کە چەندە سارد بوو. خەم و ژانێکی سەخت دایان‌گرتمەوە بە هۆی بەندکرانی برادەرە بێتاوانەکانمەوە لە سەر من، زیاد لەو خەفەتەی کە لە پەک‌کەوتنی بڵاوبوونەوە و دەست‌بەسەراگرتنی پەیامەکانی نوورەوە پەیدا بوو بوو، لەگەڵ ئەو ئازارەی بە بۆنەی پیریی و نەخۆشییمەوە ئەم‌چەشت. ئەوە هەمووی وای لێ کردم لە بێئارامیی و بێزارییدا بتلێمەوە. جا لە کاتێکا کە لەم دانەمەزراوییەدا بووم هەر ئەوە بوو عینایەتی خوایی فریام کەوتەوە و ئەو بەندیخانە سامناکەی گێڕا بە قوتابخانەیەکی نووریی[7]، بەوە سەلماندی کە بەندیخانە لە ڕاستییدا قوتابخانەیەکی یووسفییە و، پەیامەکانی نوور دەستیان بە بڵاوەکردن و پەل و پۆ هاویشتن کرد و، پاڵەوانانی قوتابخانەی «زەهرا» بە قەڵەمە کارامەکانیان دەستیان بە نووسینەوەی پەیامەکان کرد. هەتا ئەوە بوو پاڵەوانەکەی نوور[8] لە ماوەیەکدا کە لە چوار مانگ تێپەڕی نەدەکرد، لەگەڵ سەختیی ئەو باروودۆخەدا کە دەوری دابووین، زیاتر لە بیست نوسخەی لە پەیامەکانی «میوە» و «دیفاع» نووسییەوە. بەمە ئەو زیانەی کە هاتە ڕێمان گۆڕیی بۆ کەڵک و قازانجێکی**

(٧) مامۆستا ئەو پەیامانەی لە سەر ئەو پارچە کاغەزانە دەنووسیی کە دەستی دەکەوتن دوایی بەنهێنیی لە پەنجەرەی هۆڵەکەیەوە فڕێی دەدانە خوارەوە بۆ قوتابیەکانی و ئەوانیش بە پەلە دەیان نووسییەوە و لە نێو پاکەتی شقارتەدا و، بە ڕێگای تر دەنێردرانە دەرەوەی بەندیخانە.
(٨) مەبەست لە حافیظ عەلیی ئەرکون ە.

**فراوان و، بێئارامیی و بێزاریی و خەفەتەکەمانی گۆڕیی بۆ خۆشیی و شادمانیی و، بەوە نهێنیەک لە نهێنیەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەر کەوت:**
**﴿ وعسى أن تكرهوا شيئاً وهو خير لكم .. ﴾ (البقرة: ٥٦)..».**

[ ١١ ] بەرگریی لە دادگای جەزادا:

لە کاتی بەندکردنا، دادگای جەزای گەورە چەند کۆڕێکی بۆ مەحکەمەکردن بەست. مامۆستا «بدیع الزمان»یش لە بەردەم دادگادا شێرانە وەستا و بەرگرییەکی جوان و ژیرانەی لە خۆی و پەیامەکانی و قوتابیەکانی کرد:

لە وەڵامی ئەو تاوانەدا کە گوایا کۆمەڵەیەکی نهێنیی دروست کردبێ، دەڵێ:

**« بەڵێ ئێمە کۆمەڵەیەکین، ئەو کۆمەڵەیەی کە لە هەموو چەرخێکدا سێ‌صەد و پەنجا ملیۆن ئەندامی هەیە. ئەمانە بە بەجێ‌هێنانی نوێژ رۆژی پێنج جار تەواویی رێز و راستیی پەیوەندیی و بەسترانیان بە بنچینەکانی ئەو کۆمەڵە پیرۆزەیەوە بە دڵنیایی دەر دەبڕن و، لە درێژکردنی دەستی یارمەتیی و کۆمەکییدا بۆ یەکتریی پێش‌بڕکێ دەکەن. ئەمەش بە دەستووری فەرمایشتی خوا: ﴿ إنما المؤمنون اخوة ﴾. کەواتە ئێمە لەو کۆمەڵە گەورە پیرۆزەدا ئەندامین. بەڵام کارمان لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا ئەمەیە:**

**یەکەم: گەیاندنی راستییە ئیمانییەکان کە وان لە نێو قورئانی پیرۆزدا بە قوتابیانی راستیی و ئیمان بە راست‌ترین و پاک‌ترین شێوە.**

**دووەم: رزگارکردنی خۆمان لە تیاچوونی هەمیشەیی و بەرزەخی بەندی خانەی تەنیایی هەتاهەتایی.**

**بەڵام کۆمەڵە دنیاییەکان کە لە سەر فرۆفێڵی سیاسەت دامەزراون، ئێمە نە لە نزیک و نە لە دوورەوە پەیوەندییمان پێیانەوە نیە.. هەروەک پیوەندییمان بە کۆمەڵە نهێنییەکانەوە نیە کە پێی تاوانبار کراوین. ئەمە درۆیەکی هەڵبەستراوە و هیچ بناغە و پاڵپشتێکی نیە و، بە هیچ شێوەیەک پەیوەندیی بە واقیعەوە نیە. بە تایبەتیی دەروونە بەرزەکانی ئێمە بە توندیی قەدەغەمان دەکەن لەوەی کە سەر بەو جۆرە کۆمەڵگایانە بین ».**

دوای ئەوە ئەو تاوانەش دەداتە دواوە کە گوایا ئەم دژایەتیی لەگەڵ کۆماریدا دەکات و دەی‌چەسپێنێ کە بە راستیی ژیانی کۆماریی راستەقینەی پێ خۆش بووە و، رێزێکی زۆری بۆ کۆمەڵی هەنگ و مێرووله داناوە، چونکە بـــە هاریکاریی وبـــە یەکابوونەوە ژیان دەبەنە ســـەر و، پەنجا ســـاڵە ئەم بیروهەستەی بە دڵە.

دوای ئەوە لە بارەی سزا و لەسێدارەدانیەوە ڕووی تێکردن و وتی:

**« لە سەر هەر بڕیارێ لە سەرمی دەر بکەن چ لەسێدارەدان بێ، چ بە ناڕەوا کاری قورسم لە سەر دابنێن، هەر کامیان بێ، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێم: با باش بزانن کە من بەم چەشنە کارانە لە ناو ناچم، چونکە هەر چۆن بێ من دەحەوێمەوە و پشوو وەردەگرم و بۆجیهانی نوور و بەختەوەریی دەڕۆم و کۆچ دەکەم، بەڵام خۆ پەیامەکانی نوور هەر دەمێنن و لە ڕوونکردنەوەکانی خۆیاندا لە بریی من بەردەوام دەبن.**

**بەڵام ئێوە ئەی دوژمنە شاررراوەکانمان و، ئەی ئەو بەدبەختانەی کە هەرچیەکیان لە تواناداپە لە بەر بەرژەوەندیی گومڕایی و لەڕێ لادان بۆ تێکشکاندنمان بەختی دەکەن! لە بەر ئەوەی بە «علم الیقین» دەزانم و بە بینینی عەیان ئەو لەناوبردنە هەمیشەییە کە بۆتان بڕیار دراوە و ئەو بەندیخانە تەنیاییە هەتاهەتاییە کە چاوەڕوانتان دەکات، دەبینم، ئەوا بچووکترین گومانم لەوەدا نیە کە من توندترین و خراپترین تۆڵەتان لێ دەسێنم. جا کە ڕاستیی بەم شێوە بێ ئەوا دوای ئەوە بە لامەوە گرنگ نیە هەرچی بکەن.. ئەوەتا بە پێی توانا و بەوپەڕی غیرەت و هێمنیی و دامەزراویی تەواوی دڵەوە ئامادەی سپاردن و بەختکردنی گیانم ».**

دوای ئەوە مامۆستا لە هەڵگرانی قورئان داوا دەکات هەرگیز بیر لە بەکارهێنانی هێزی ماددیی نەکەنەوە بۆ تۆڵەسەندن یا گەیشتن بە حوکم و کاربەدەستیی. چونکە ئەو سۆز و دڵنەرمیی و ڕاستیی و چاکەخوازییەی کە پەیامەکانی نوور دەستیان پێوە گرتووە قەدەغەی موسڵمانان دەکەن لە تێکەڵبوون بە سیاسەتی دنیاوە کە دەبێتە مایەی پێشێلکردنی مافی بێتاوانان و ستەملێکردنیان، کە دەڵێ:

**« چەرخێکی لەناوبەری وەک ئەم چەرخەمان کە خۆپەرستیی وڕەگەزپەرستیی و زۆرداریی سەربازیی، کە بە بۆنەی جەنگی جیهانیی دووەمەوە باڵی کێشاوە بە سەریا، هەروەها بەبەردبوون و ڕەقبوونی دڵەکان کە زادەی گومڕایی و لادانن لە ڕاستەشەقام.. هەموو ئەم کارانە بەریان چڵ کردووە بۆ شێوە و جۆری تازە لە شێوازی جەور و ستەم و زورداریی، بە شێوەیەک کە ئەگەر هەندێ خاوەن ماف هەوڵیان دا بەرگریی لە مافە شەرعیەکانیان بکەن بە هێزی ماددیی، ئەوە دەبێتە مایەی زەرەر و زیانێکی گەورە بۆ زۆرێ لە بێتاوانە بێ گوناهەکان، بە بیانووی لایەنگیریی و خۆشلێهاتنەوە. بەمە ئەم ئەهلی ڕاستیە زاڵمتر دەبن. دیسان بە ژێرکەوتوویی دەمێننەوە و ئەمەش لە بەر ئەوەی**

**کەسانێک کاریان وەک ئەوەیە لە پێشەوە باس کرا، هەڵەی کەسێک و، یا دوان دەکەنە بیانوو بۆ لێدانی بیست یا سیی بێتاوان و خراپترین جۆری ئازار و سزایان پێ بچێژن.**

**ئەگەر کارەکە پێچەوانە بوو بەوەی کە خاوەنانی مافی شەرعیی هەوڵیان دا لە پێناوی داد و ڕاستییدا لەو هێزانە بدەن، لەوانەیە یەکێکیان سەرکەوتوو بێت بەرامبەر بە قوربانیی‌دانی سیی لە هاوەڵەکانی و، ئەنجام لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەوەیە لە مەیدانی جەنگ بە ژێرکەوتوویی دەر دەچن نەک بە سەرکەوتوویی، بە دۆڕاویی نەک بە بردنەوە.**

**ئەگەر خاوەنانی ماف هەوڵیان دا یاسای وێنە بە وێنەی پڕ ستەم جێ بەجێ بکەن، جا - بۆ نموونە - ناچار دەبن بە بۆنەی هەڵەی کەسێک یا دوانەوە بیست سیی هەژاری بێتاوان تێک بشکێنن، ئیتر ئەو کاتە بە ناوی ڕاستیی و عەدالەتەوە ستەمێکی لە ڕادەبەدەر دەکەن.**

**جا کەواتە ئا ئەمە هۆ و دانایەتیی ڕاستەقینەیە لە دوورکەوتنەوەمان لە سیاسەت و ڕاکردنمان لە دەست‌خستنە کاروباری ئیدارییەوە. دەنا ئەوەندە هێزی ڕەوا و ڕاستگۆیی لێبڕاومان هەیە دەتوانین بە تەواوترین شێوە بەرگریی لە مافەکانمان بکەین.**

**جا کە مادام هەموو شتێ لە ناو دەچێ و کاتییە و، مردنیش نامرێت و، دەرگای گۆڕیش کراوەیە و دا ناخرێت و، لەوانەیە مەینەت و زەحمەت بگۆڕێ بە سۆز و ڕەحمەت، شیاوتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە بێدەنگ بین و، پشت بە خوای گەورە ببەستین و، خۆمان بە ئارام لە ناخۆشییدا و بە سوپاس لە خۆشییدا ڕابزێنینەوە»[٩].**

دوای ئەوە بەرگریی لە پەیامەکانی نوور دەکات و گرنگییان دەر دەخا و، بێتاوانیی قوتابییەکانیان دەخاتە ڕوو کەوا هیچ کەسێ مافی ئەوەی نیە هێرش بکاتە سەر پەیامەکانی نوور بە بۆنەی هەڵەی شەخسیی خۆی و هەندێ لە براکانیەوە؛ چونکە پەیامەکانی نوور، نووری قورئانن و پەیوەندییان بەوەوە هەیە، قورئانیش ڕاستەوخۆ بە عەرشی مەزنەوە بەستراوە، بۆیە کەسێ توانای نیە بگاتە عەرش و قورئانی لێ بکاتەوە.

---

(٩) لەمەی سەرەوەدا مامۆستا چەند هۆیەک دەخاتە ڕوو کە بوونەتە مایەی ئەوەی خۆی لە سیاسەت بە دوور بگرێت و پەنابگرێ بە خوای گەورە لە سیاسەت و فڕوفێڵەکانی، چونکە بە هیچ شێوەیەک خزمەتی ئادەمیزاد ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو ئاژاوە و پشێویی و تاڵیی و سوێریی ژیانی ئەم سەرزەوییە بەرهەمی تەو درەختە نەگبەتەیە، وەک لە بەر چاودایە.

ڕوونی دەکاتەوە بۆیان کە پەیامەکانی نوور فەڕ و بەرەکەتێکی ماددیی و مەعنەویی زۆریان بووە بۆ گەل و ولات، بۆیە دوژمنایەتیی‌کردن لە گەڵیانا دەبێتە مایەی زەرەر و زیانێکی زۆر بۆ ولات و بەو ئاسانیە لا نابرێت.

قوتابیەکانیش هاوشانی کەسانی تر نین و بەو ئاسانیە واز لە بانگەوازی پیرۆز ناهێنن و بە پشتیوانیی خوای گەورە هەرگیز نابەزین.

هـەروەها دەری بڕیی کە قورئان لـــە هەندێ کات‌دا بەرگریی ماددیی لە ئیمان‌داران قەدەغە کردووە، واتە: ئەو جۆرە هەڵوێستانە بە زیانی ئیسلام و موسڵمانان تەواو دەبێ، بۆیە هەرگیز ناوی خۆیان بە کاری منالانە نازڕێنن. خۆ ئەگەر ناچار بکرێن ئەوا بێ‌گومان زەندەقە و مونافیقان لە ئەنجاما هەزار جار پەشیمانیی دەر دەبڕن.. دەڵێ:

« **کورتەکەی: مادەم ئێمە دەست ناخەینە کاروباری ئەهلی دنیاوە، کەواتە لە پێش‌تر و ڕەواترە ئەوانیش دەست نەخەنە کاروباری قیامەتیی و خزمەتی ئیمانیی ئێمەوە**».

« **ئێوە دەڵێن: بۆچی ماوەی بیست ساڵە تاقە جارێک شەپقەکەمانت لە سەر نەکردووە ؟ و تاقە جارێک لە بەردەم دادگاکەماندا سەرت ڕووت ناکەیت، لەگەڵ ئەوەشا کە حەفدە ملیۆن کەس لەگەڵ ئەم بەرگەدا ڕاهاتوون ؟**

**منیش دەڵێم: نە حەفدە ملیۆن دەبن و نە حەوت ملیۆنیش، بەڵکو کەمێکی زۆر کەمیش بە ویست و هەڵبژاردنی خۆیان لەبەریان نەکردووە، جگە لە چەند گێل و گەلحۆیەک کە هەمیشە بە دوای سەرشۆڕیی و نزمیی ئەورووپادا هەڵپە دەکەن.**

**کەسێ وەک من کە ماوەی بیست و پێنج ساڵە وازم لە ژیانی کومەڵایەتیی هێناوە، لەمەدا پێی ناڵێن لادەر یا سەرپێچی‌کەر، وا دا بنێن ئەمە سەرپێچییش بێت، خۆ مادەم موصطەفا کەمال خۆی نەی‌توانی ئەم سەرپێچییەم بشکێنێ و، دوو دادگا و حاکمی سێ ویلایەت نەیان‌توانیوە کارم تێ بکەن، ئیتر ئێوە چیتانە وا کاتی خۆتان لەمەدا بە فیڕۆ دەدەن ؟** ».

لە شوێنێکی تری بەرگرییەکەدا دەڵێ:

« **ئەمە ڕاستیەکە و ئێمە بە هەموو هێزێکەوە دەڵێین:**

**ئەی ئەوانەی ئایینی خۆتان بە دونیا فرۆشتووە، ئەی کافرە چارەڕەشەکان، هەرچیتان پێ خۆشە خەرجی کەن، سەرەنجام دنیـا دەبێتە نەگبەتیی بۆتان.. ئەم بانگەوازە پیرۆزە ملیۆنەها پاڵەوان بوونەتە قوربانیی لە پێناویا، ئێمەیش ئامادەین وەک ئەوان گیانمان لـــە پێناویا بەخت بکەین. ئێمە مانەوەی بەندی**

خانەمان هەزار جار بەلاوە چاک‌ترە لەوەی کە ببینین دەست‌درێژیی بکرێتە سەر ناموسی خەڵک. لە سایەی ئەم زۆرداریی‌یەدا ناگوڵجێ بوترێ: سەربەستیی هەیە: سەربەستیی زانست، یان سەربەستیی ویژدان، یان سەربەستیی دەربڕین، یان سەربەستیی ئایین.. تەنها ئەوە ماوەتەوە بۆ سەربەستی‌خوازان کە بڕن یان لە بەندی‌خانەکاندا بمێننەوە و خۆیان بدەنە پەنای خوای گەورە و بڵێن: ﴿ حسبنا الله ونعم الوكيل ﴾.

ئەو داوایەی لە سەر پەیامەکانی نوور تۆمار کراوە، کارێکی شەخسیی و، شتێکی ساکار نیە تا لە شانی کەم بکرێتەوە، ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە نەتەوە و نیشتمان و دەوڵەتەوە هەیە و، پەیوەندیی بە نەتەوەی ئیسلامەوە هەیە و، سەرانسەری جیهانی ئیسلامیی بەوپەڕی گرنگیی‌پێ‌دانەوە لەم مەسەلەیە دەکۆڵێتەوە.

ئاشکرای دەکەین کە ئێمە سەر بەو کۆمەڵە ئیسلامیەین کە زیاتر لە سێ‌صەد ملیۆن موسڵمانی تیایە. ئێمە کۆمەڵی خواین.. ئێمە برای هاوکاری یەکین.. خزمەت‌کاری قورئان و سەرباز و کۆمەڵی خواین..

بەڕێزان !

سەرۆکی دادگا !

ئێوە کە ئەم فەرمانانە دژی پەیامەکانی نوور و قوتابییەکانیان دەردەکەن و، واز لە کوفر و ئیلحاد دەهێنن و هەوڵی شاردنەوە و ون‌کردنی ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان، لە بەر چاوی مرۆڤا، دەدەن و، دەتانەوێ بەمە ئەو ڕێگایە داخەن کە ملیۆنەها، بەڵکو صەدەها ملیۆن، لە موسڵمانان گرتیانە بەر و بەم بونەوە گەیشتنە بەختەوەریی هەمیشەیی ڕاستەقینە، ئەوا جگە لە ڕق و قین و بێزیان هیچی ترتان دەست ناکەوێ.

خوانەناسان و مونافیقان لە خۆتانیان بایی کردوون و زوڵمیان لە ناوچاوی داد و ڕاستیی داوە و، دەوڵەتیان لە کاری بناغەیی و سەرەکیی خۆی لا داوە بۆ کاروبارێ کە هیچ کەڵکێکی نیە و، زوورداریان ناو ناوە: کۆماریی و، لە ئایین هەڵگەڕانەوە: نەریت و، نەفامیی و هەرزەیی: شارستانییەت و، ستەم: یاسا. بەمە ناپاکییان لەگەڵ نیشتمانەکەیان کرد و وەها پشتیان شکاند هەرگیز هیچ بێگانەیەک نەی‌دەتوانیی ئاوا پشتی بشکێنێ ».

بەڵێ، مامۆستا هیچ تاوانێکی بە خۆیەوە شک نەدەبرد، بۆیە پیاوانە هەموو ڕاستیەکی کەڵک‌بەخشی دا بە گوێی کۆڕی دادگادا، تا ئەگەر ڕاست دەکەن و ناپاکیی ناکەن با داچڵەکێن و لە ڕاستیی بگەن.

بڕیاری دادگا له (١٥)ی حوزەیرانی ١٩٤٤دا دەرچوو و مامۆستا تیایا به بێتاوان دەرچوو و هەر تۆمەتێ درابوویه پاڵی هیچیان وا دەر نەچوو، کەچی هەر له بەندییش ڕزگاری نەبوو، بەڵکو بۆ ماوەی دوو مانگ له ئوتێلێکدا، به بیانووی گەیشتنی فەرمانی پایتەختەوه بەند کرا، تا ئەوه بوو له کۆتایی ئابی ١٩٤٤ دا فەرمان گەیشت به ڕەهەندەکردنی بۆ قەزای ئەمیرداغ که سەر به ویلایەتی ئافیوونه، هەر چەنده خۆی و پەیامەکانی بێتاوان دەرچوون و دادگا پاکییانی دەرکرد !!.

# قوتابخانەی یووسفیی سێیەم

[ ١ ] بۆ ئەمیرداغ:

دەوڵەتێکی بەدەسەڵات هەموو هێزی خۆی دەخستە کار بۆ تاوانبارکردنی کەسێکی بێتاوانی بێدەسەڵات، لەگەڵ ئەوەشا کە دادگا ناچار ئەبوو دان بنێ بە بێتاوانییدا، هێشتا کۆڵیان نەئەدا و هەر خەریکی ئازاردانی بوون !.

مامۆستا ئەگەر تاوانی کەوتە گەردن ئەوا بەند ئەکرێ، ئەگەر بێتاوانیش دەرچوو ئەوا دەست بە سەر ئەبێ و نابێ هیچ جۆرە سەربەستییەکی هەبێ. تاقە کەسێکی پیری نەخۆشی تەنیا و بێکەس چۆن ئەبێ دەوڵەتێک بە دەستیەوە گیر بخوا ؟!

کەسێکی بێتوانا و پیر و نەخۆش، دەوڵەتیش هەموو هێزێکی دژیبخاتەکار هێشتا کۆڵیش نەدا و ڕۆژ بە ڕۆژ نووسەران و خوێنەرانی پەیامەکانی لە زیادکردنا بن و ئەم سەر و ئەو سەری وڵات بگرنەوە، مایەی ڕقهەڵسانی دەوڵەت بوو..

لە عەصری ڕۆژێکی کۆتایی مانگی ئابی ١٩٤٤دا مامۆستا نوورسیی گەیەنرایە شاری «ئەمیرداغ» و درایە دەست پۆلیسخانەکە.

جا ئەبێ خانوویەکی وەهای بۆ پەیدا بکرێ تا بە ئاسانیی و هەمیشە لە ژێر چاودێریی پۆلیـــسدا بێت. کەواتە پێویستەماڵەکەی لە بەردەم پۆلیسخانەکەدا بێت.

لێپرســـراوی پۆلیسخانە پۆلیسێکی بـــانگ کرد کە ناوی «ئیبراهیم مەنگوەرلی» بوو. داوای لێ کرد خانوویەک پەیدا بکات بۆ مامۆستا نوورسیی. کە پۆلیسەکە ماموستای بینی و زانی ماموستایە خۆی پێ نەگیرا راپەڕی و هەردوو دەستی ماچ کرد.

لە بەردەم پۆلیسخانەدا خانوویەکی دوونهۆم هەبوو، نهۆمی دووەمی ماڵی پیاوێکی تیا بوو کە ناوی «حەسەن باقرچیی» بوو. خاوەن ماڵ بە شەو و بە ڕۆژ سەر خۆش بوو و نەیدەتوانی دەستبەرداری مەیخواردنەوە ببێت. ئیبراهیمی پۆلیسیش جار جار لەگەڵیا دەیخواردەوە.

پێی وت: وەستا حەسەن، نهۆمی سەرەوە بدە بە کرێ با مامۆستامان تیایا دانیشێ.

وتی: برا گیان، من پیاوێکی سەرخۆش و ئەویش زانایەکی ئایین، جا چۆن دەتوانم لە گەڵیا بگونجێم ؟

پۆلیسەکە لەوەش دەترسا مامۆستا لێی تووڕە ببێ چۆن بە تەنیشت سەرخۆشێکەوە خانووی بۆ دەگرێت ؟

دوای کەمێک مامۆستای ئاگادار کرد کە خانووەکە هەیە، بەڵام خاوەنەکەی مەیخۆرە.

مامۆستا تووڕە نەبوو، هەروەک نەزانێ تووڕەبوون چیە، بەڵکو وتی:

**- قەی ناکا برا گیان، با سەرخۆش بێت.**

ئیبراهیم دەڵێ:

«خێرا هەواڵەکەم بردەوە بۆ حەسەن و پێم وت: خانووەکەمان بە کرێ گرت. هەر ئەو ئێوارەیە گواستمانەوە بۆ خانووەکە، کاتێ دەڵێم: گواستمانەوە بۆی، ئەو شتومەکەی گواستمانەوە بریتی بوو لە چەند کەلوپەلێکی زۆر سادە، وەک: سەبەتەیەکی نان و مەسینەیەکی دەستنوێژ، چونکە وەک خەڵکی تری دنیا کەلوپەلی نەبوو.

حەسەن لەوێ چاوەڕوانمان بوو، مامۆستا لەگەڵیا هاتە گوفتار:

**- وەستا حەسەن، وەرە بۆ ئێرە.**

حەسەن لەوپەڕی شەرمەزاریدا هات:

- بەڵێ مامۆستا گیان.

**- ئایا مەی دەخۆیتەوە ؟**

- بەڵێ گەورەم.. بەیانیی و ئێوارە دەیخۆمەوە.

مامۆستا دەستی بەرز کردەوە و خستیە سەر پشتی و سێ جار دەستی بە پشتیا هێنا:

**- دەی کوڕەکەم، بە فەرمانی خوا لەمە ڕزگارت دەبێ.**

ئەم پیاوە کە بەیانیی و ئێوارە دەستبەرداری مەی نەدەبوو، ئەو ڕۆژە نوێژی بەیانیی لەگەڵ مامۆستادا کرد و، دوای ئەوە بە هیچ شێوەیەک تامی مەی نەکرد، بەڵکو لەگەڵ مامۆستادا بەردەوامی نوێژ بوو.. ئای کە جێی سەرسوڕمانە ! ئەم حەسەنە کە هیچی لە بارەی ئایین یا نوێژەوە نەدەزانی چۆن بەم شێوەیە گۆڕا ؟!! هەرگیز ئەمە نەخورپاوەتە دڵمەوە، بۆیە مامۆستام زۆر بە گەورە دانا ».

مامۆستا عادەتی وا بوو لە وەرزی هاوینا لە ماڵە دەر دەچوو بۆ دەشت و باغەکانی نزیک ئەمیرداغ، ئا لەم کاتەیشدا پۆلیس دەکەوتنە شوێنی و

چاودێرییان دەکرد. هەتا ئەوە بوو جارێکیان ڕێیان پێ گرت و ئازاریان دا بەوەی کە مێزەرەکەیان لە سەری داگرت و بەرەو پۆلیس‌خانە بردیان گوایە پێچەوانەی یاسای جل‌وبەرگ جوولاوەتەوە.

[ ٢ ] ئاگادارکردنی کاربەدەستان:

لە لایەکی ترەوە پزیشکی ڕەسمیی ئەو کاتەی «ئەمیرداغ» دانی پیا نا کە ژەهری بۆ کراوەتە ناو خۆراکەوە، ئەوە بوو هەفتەیەک لەجێدا کەوت و بەدەست ئازارەوە دەتلایەوە، بەڵام خوای گەورە بە سۆزی خۆی لە فڕوفێڵی دوژمنان ڕزگاری کرد. ئیتر مامۆستا زۆر تووڕە بوو لەم بارەی تیایا دەژی کە زۆر جیاوازیی نیە لە بەندیی تەنیایی، بۆیە ئەم نامەیەی بۆ سەرۆکی هێزەکانی ئاسایشی پارێزگای «ئافیون» نووسی:

**« نازانم بۆچ ئاوڕێک بە لای ئەو هەڵسوکەوتە نایاسایی و بێویژدانییەوە نادەیتەوە کە بەرامبەرم دەکرێت و کە تا ئێستە وێنەیم نەدیوە ؟ بۆ نموونە: کە دەمەوێ بچم بۆ مزگەوت لەو کاتانەدا ئاوەدانیی کەمە، تا پاداشتی نوێژی کۆمەڵم لەگەڵ چەند کەسێکی کەمدا دەست کەوێ، فەرمان دەردەچێ و بە یەکجاریی لە چوون بو مزگەوت قەدەغەم دەکات. جا چ یاسایەک ئەمە لەسەر کەسێک پێویست دەکات کە بە دەست غەریبیی و نەخۆشـیی و پیریی و دەســتکورتییەوە گیری خواردووە؟ چ بەرژەوەندییەکی وا تێدا ؟ دوای ئەوە چیی تیایە دۆستایەتیی لەگەڵ چەند کەسێکا بکەم کە یارمەتییم دەدەن لە هەندێ کاروباری پێویستمدا، کە من وەک لە بەندیخانەیەکی یەک کەسیدا، لە ژوورێکی سارد و سڕ و، لە ئاوارەیی و نەخۆشیی و هەژاریی و پیرییدا بژیم، چ یاسایەک قەدەغەی ئەوە دەکات ؟ چ یاسایەک قەدەغەی پەیوەندییم دەکا لەگەڵ یەک دوو کەسێکا کە پێیان خۆشە هەندێ خزمەتی پێویستم بۆ جێ بە جێ بکەن، کە من خۆم ناتوانم بیانکەم ؟».**

مامۆستا زۆر نارەحەت بوو بە دەست کاربەدەستانی دەوروبەریەوە، بۆیە لەوە نەدەوەستا کە بە نامە حاڵی خۆی بخاتە بەردەم کاربەدەستانی ژوورترەوە تا لەو هەڵوێست و بارودۆخە ناڵەبارەی دەوری ئاگادار بن، ئەمەتا لە یەکێ لەو نامانەدا حاڵی خۆی دەخاتە بەردەم یەکێ لە لێپرسراوانی پایتەخت، کە دەنووسێ:

**« ئەگەر دادگەر و داواکار یەکێ بن، دەبێ شکات بۆ لای کێ ببرێ ؟ ماوەیەکی زۆرە بە دەست ئەم گیروگرفتەوە سەرسامم.. بەڵێ حاڵی ئەمڕۆم، کە**

بەر دراوم و لەژێر چاودێرییدام زۆرم بە لاوە گرانترە لەو ڕۆژانەی کە تیایاندا نەند بووم و، تاقە ڕۆژێ لەم ژیانە زیاتر تەنگاوم ئەکا لە مانگێکی تەواوی ئەو بەندییە تەنیاییەم. ئەوەتا لەم زستانە ساردەدا، لەگەڵ لاوازیی و بەساڵاچوونمدا هەموو شتێکم لێ قەدەغە کراوە، هەر چەندە من بیست ساڵە تالاوی بەندی تەنیایی دەچێژم. من دەڵێم: گرنگترین کاری مرۆڤانەی ئەم دەوڵەتە بریتییە لە پارێزگاریی ئەو مافانەم کە کەس ناتوانێ چاویان لێ بنووقێنێ. چونکە دوای چاودێرییەک کە نۆ مانگی خایاند بۆ ئەو نووسینانەی کە لە ماوەی بیست ساڵدا نووسی بوومن، دەوڵەت ناچار بوو دان بنێ بەوەدا هیچ شتێکی دژ بە یاسایان تێدا نیە و من بێتاوانم، بەڵام چەند دەستێکی نادیار هەن - بۆ ئەوەی خزمەتی دەسەڵاتی بێگانە بکەن - هیچ بە لایانەوە گرنگ نیە لە پێناوی تاوان بارکردن و بێدەنگکردنمدا، دەنکە گەنمێک ئەوەندەی گومەزێک لێ بکەن. هەروەها مەبەستێکی تریان هەیە کە ئەمەیە: چی ئارامم هەیە تەواو بێ و دوای ئەوە بڵێم: ئەمەندەم بەسە.. بەڵێ، داماڵینم لە هەموو مافە مرۆڤایەتییەکانم - دوای هەموو ئەمانە - لە ڕاستییدا ئەوپەڕی نزمییە، بەڵکو خراپترین جۆری ستەمە..

بیستوومە لێپرسراوان گوزەرانی دنیایی منیان داوەتە دەست کاربەدەستانی ئەم ناوچەیە، من سوپاسی ئەوانە دەکەم، بەڵام لایان ئاشکرای دەکەم کە سەربەستییم لە بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانمدا، کە یەکەم پایەی دەستووری ژیانمە، لە هەموو شتێک بە لامەوە گرنگترە.

زەوتکردنی سەربەستیی لێم بە چەند بروبیانوویەکی ساختە، وام لێ دەکا زۆر بێزاری ژیانم بم، هەر چەندە ئەو ژیانە بە خۆشگوزەرانیی دەوری درابێ.. ناڵێم گرتن یان بەندکردن، بەڵکو فەزڵی ئەو گۆڕە تاریکە دەدەم بە سەر ئەم حاڵەدا. پێویستە لە سەر ئەوانەی کە دەڵێن نایانەوێ ستەمم لێ بکەن و حوکمی بێتاوانییم دەردەکەن، پێش هەموو شتێک سەربەستییم بۆ بگێڕنەوە و، بە خراپە توخنی سەربەستییم نەکەون، من دەتوانم بێ خۆراک بژیم، بەڵام ناتوانم بێ سەربەستیی بژیم.

بەڵێ، ئەوەی بە درێژایی نۆ ساڵ بە پوولێک، کە لە دووسەد لیرەی تورکیی زیاتر نەبووبێ، گوزەرانی کردبێ، بێ ئەوەی خۆی تووشی سەرشۆڕیی سواڵ و صەدەقە و تووشی زەکات و دیاریی وەر گرتن بکات، بێگومان ئەمڕۆ زیاتر پێویستیی بە سەربەستییە نەک گوزەران.

**بەلاَم من دەڵێم: ئەوەی جێی دە کەسم بۆ پڕ بکاتەوە کە لێم دوور دەخرێنەوە، ئەوەیە ملیۆنێک لە موسڵمانان خەریکی لێکۆڵینەوەی پەیامەکانی نوورن کە لە نێوانیاندا بلاَو بوونەتەوە، ئەگەر ئەوان بتوانن لە بەردەم خەڵکا بێدەنگم کەن، ئەوا خۆ ناتوانن پەیامەکانی نوور بێدەنگ کەن، کە پەردەی دڵان هەڵ دەدەنەوە و دەڕۆنە ناویەوە. هەموو دانەیەکیان لە وتە و ڕوون کردنەوەدا، لە جێی منایە و، هیچ هێزێکی سەرزەویی ناتوانێ بێدەنگیان کات ».**

[ ٣ ] ژەهرپێ دان:

هەر چەند ماموَستا ئاوا بێ ناز و بێسەربەستیی بوو، بەلاَم یەکی کاری سەرشانی نەدەخست، خەریکی خواپەرستیی بوو، بۆیە کەم دەخەوت و زۆر کەمی دەخوارد بە ڕادەیەکێ ئەو خۆراکەی ئەو دەیخوارد بەشی مرۆڤێکی ئاسایی نەدەکرد، بە قوتابیەکانی دەوت:

**«خەوی فیطریی و سروشتیی لە ڕۆژێکا پێنج کاتژمێرە».**

یەکێ لە ڕەوشتەکانی کە بە درێژایی تەمەنی پیرۆزی دەستبەرداری نەبوو، ئەوە بوو شەوانی بە تەسبیح و تەهلیل و نزا و پاڕانەوە و شەونوێژ بەسەردەبرد و، هەمیشە دەستنوێژی هەبوو، هەتا دراوسێکانی «ئیسپارتە» و «بارلا» و «ئەمیرداغ» دەیانوت بە قوتابیەکانی:

لە هەر کاتێکی شەوا سەیری ماڵی ماموٚستامان بکردایە چرا کزەکەیان دەبینی کە داگیرسا بوو و دەنگ و ناڵەی ذیکرە خەمبار و پاڕانەوە ناسکەکەیان دەبیست.

لاوازیی و نەخۆشیی وەها زۆریان بۆ ماموٚستا هێنا بوو لە ژوورەکەیا بەرگەی سەرمای نەدەگرت، ئەگەر چی هەمیشە مەقەڵیەکە ئاگری تیا بوو و ڕۆژی چەند جارێ زۆرپاکەشی دادەگیرساند، کەچی خوانەناسان بە چەند بیانوویەکی هیچ و پووچ بە تەنیا، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ کردیانە هۆڵێکی گەورەوە لە کاتێکی زۆر سارد و سڕا کە دەتوت زەمهەریرە.

لەگەڵ ئەمەیشا زۆر جار هەوڵ دەدرا ماموٚستا لە ناو ببرێت ئەویش بەوەی کە ژەهریان بۆ دەکردە ناو خۆراکەوە. بۆیە قوتابیەکانی زۆر بە وردیی خواردنیان بۆ دەکری، ئەو نانەی نانەوا دەیدانێ نەیاندەویست بەڵکو خۆیان هەڵیان دەبژارد بۆی، وە بۆ کڕینی ماست دەبوایە لە ناو صەدەها قاپدا قاپێکیان بۆ هەڵ بژاردایە.

هەروەها بۆ ئاوهێنانیش، زۆر ئاگادار بوون، هەر چەندە خەڵکیی خۆشیان دەویستن چونکە یارمەتیدەری مامۆستا بوون و پێیان خۆش بوو یارمەتییان بدەن، کەچی ئەمان ترمۆسەکەیان نەدەدایە دەست کەس، ئەگەرچی قوتابیی نووریش بوایە، و هەرچییان بۆ دەسەند دەیانخستە دەفرێکی داخراوەوە. ئەمەش جێی سەرسوڕمان نەبوو؛ چونکە حەڤدە جار هەوڵ درا بۆ ژەهرپێدانی.

ئەوەبوو جارێکیان مامۆستا بە تەنیا بە سواری ئەو ئەسپەی کە موحەممەد خانچیی پێی دابوو، سەرکەوتە سەر چیاکان، لە ڕێدا پیاوێک خواردنێکی ژەهراویی دەرخوارد دا و لەو شوێنەدا کە هەموو جارێ بۆی دەچوو لە سەر ئەسپەکە کەوتە خوارەوە. ئەسپەکەش بە تەنیا گەڕایەوە بۆ شار.

لەو کاتەدا تەقە لەماڵی موحەممەد فەیضیی درا، کە یەکێ بوو لە قوتابیە پێشینەکانی نوور و، گوێی لە دەنگێ بوو بانگی لێ دەکرد: «مامۆستا بانگت دەکا». کاک موحەممەد هاتە دەرەوە کەسی لە دەرگا نەبینی، سێ جار ئەم تەقەلێدانە دووپات بۆوە، دوای ئەوە کاک موحەممەد ڕۆیشت بۆ تەویلەی ئەسپەکە، سەیری کرد وا لەوێ بەلام مامۆستا لە ماڵەوە نیە، بە پەلە سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو شاخ کەوتە ڕێ، بۆ ئەو شوێنەی مامۆستای بۆ دەچێ سەیری کرد وا لەوێ کەوتووە و خەریکە بێهۆش ببێ، مامۆستا کەمێ چاوی کردەوە و وتی:

**- موحەممەد فەیضیی بىرام ! ژەهریان دەرخوارد دام و ، ئەوەی پێــی دام دەیناسم.**

کاک موحەممەد مامۆستای هەڵگرت و سواری ئەسپەکەی کرد و گێڕایەوە ماڵەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر لە جێگادا مایەوە کە دەیوت:

**- سوپاس و ستایش بۆ خوا، لە کاری ژەهرەکە پاراستمی، ئەوە بوو** «الجوشن الكبير» **بووە هۆیەک دژی کاریگەریی ژەهرەکە و بە تەواویی کاری لێ نەکردم و، تەنها کاری لە گوێم کرد..**

## [ ٤ ] مامۆستا لە دڵی خەڵکیدا:

هەتا دەوڵەت دژایەتیی لەگەڵ مامۆستادا دەکرد، ئەم زیاتر دەچووە ناو دڵی خەڵکەوە. ئەوە بوو یەکێ لــــە پیاوە دەوڵەمەندەکانی «ئەمیرداغ» کە بینیی مامۆســـتا بە پێ هاتوچۆی کێڵگە و باغەکانی نزیک شـــار دەکات و چەند کاتژمێرێکی پێ دەچێ، ئوتومبێلێکی بۆ تەرخان کرد لە سەر ئەمە درا بە دادگا و موحاسەبە کرا.

خۆشەویستیی مامۆستا دڵی زۆر کەسی داگیر کرد بوو، ئەوەتا ئیبراهیمی پۆلیس، کە خانووی بۆ دۆزییەوە، باسێکی ئەو کاتە دەگێڕێتەوە کە مامۆستا برایە بەردەم دادگای ئافیوون:

( چاوەڕوان ئەکرا مامۆستا ببرێتە بەردەم دادگا، بۆیە خەڵکێکی زۆر لە هەموو لایەکەوە بەرەو ئافیوون هات.. شەقام و کۆڵانەکان وەک ڕۆژی حەشر پڕ پڕ بوون لە خەڵک... مامۆستاش وەک پیاوکوژێکی خوێنڕێژ بێ، کە دەیان کەسی کوشتبێ، بەرەو دادگا دەبرا.. ئەو کاتە هێشتا لە خزمەتا بووم، لە ناکاوا خۆمم ڕوو بە ڕووی مامۆستا نوورسیی بینییەوە، خێرا سەلامی سەربازییم لێ کرد ! لەو کاتەدا یارمەتیدەری هێزی سواریی تێپەڕی دەکرد. هەر کە بینیمی سەلام دەکەم قیڕاندی:

«سەربازان ! ئەم پۆلیسە بگرن !»

گرتمیان و بردمیان بۆ ژووری فەرماندە.

یارمەتیدەر دەستی کردە ڕاڤەکردنی ڕووداوەکە و وتی: ئەم پۆلیسە سەلامی لە «بدیع الزمان» کردووە.

فەرماندە لە یارمەتیدەر خراپتر بوو.. هەر کە ئەوەی بیست تووڕەییەک گرتی و وەک شێتی لێ هات و خەریک بوو مووی دەر کێشێت و وتی:

- ئایا ڕاستە سەلامت لە «بدیع الزمان» کردووە ؟

- ئایا من کەسێکی کافری بێ ئایینم ؟ من موسڵمانم.

وەک شێت قیڕاندی:

- درێژی کەن بۆ دارکاریی ژێر پێی (فەلاقە).

درێژیان کردم بۆ دارکاریی و هەرچی داریان دەدا لە ژێر پێم هاوارم دەکرد:

- مادام سەلامم لە مامۆستا کردووە و وتووێژم لە گەڵا کردووە چیتان پێ خۆشە بی کەن.

ئەم وتانە زیاتر کاری تێ دەکردن و دەیان قیڕاند:

- نابێ کەسێکی سوپایی سەلام لە مامۆستایەکی ئایینیی بکات.

وەڵامم دەدانەوە: بەڵکو وا دەکات، بۆچ ئێوە کەسێکی سوپایی بەچی دەزانن؟ ئایا موسڵمان نیە ؟

دوای لێدان هەفتەیەک خستمیانە بەندیخانەوە ).

دەسەڵاتی ئەو ڕۆژە بە هەموو شێوەیەک موراقەبەی مامۆستای دەکرد و هیچی دەست نەدەکەوت، هەوڵی لەگەڵ قوتابیانی نووردا دا ئەوانیش بە هیچ شێوەیەک بۆی نەدەکەوتنە داوەوە، ڕۆژ بە ڕۆژیش لە زیادکردن و پەرەسەندنا

بوون، بە تایبەتیی دوای تەبرییەبوونی پەیامەکان لە دادگای «دەنیزلیی».
دەوڵەت زۆر حەزی دەکرد ئەمان لە یاسا لا بدەن و بکەونە هەڵەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا بە ژیرانە دەجووڵانەوە.

## [ ٥ ] بەندیخانەی «ئافیوون»:

مامۆستا نوورسیی تەمەنی گەیشتبووە حەفتا و پێنج ساڵ، ماوەی بیست و سێ ساڵ دەبوو کە لە شاخی ئەرەک بە ناڕەوا داگیرابووە خوارەوە و ڕەهەندەی خۆرئاوای وڵات کرابوو، ئەم شار و ئەو شار، ئەم بەند و ئەو بەند، لێرە موراقەبە و لەوێ تەنگ پێهەڵچنین و لەو لا بە زۆر نیشتەجێ کردن.

بیست و سێ ساڵی ڕەبەق مامۆستای خواناس بە بێتاوان، تاوانبار دەکرا، هێشتا کاربەدەستان دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە و وازیان لێی نەدەهێنا.. هێشتا پیاوانی ئاسایش خەریکی موراقەبەی هەڵس و کەوتی خۆی و قوتابییەکانی بوون و بۆ بیانوو دەگەڕان تا بیانگرن و بیانخەنە بەندیخانەوە..

ئەوە بوو وەک جارانیتر لە (٢٣)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)دا پۆلیس دایانەوە بە سەر ماڵی مامۆستا و (١٥) کەس لە قوتابیانی نوورا و هەموویان گرتن و بردنیانن بۆ بەندیخانەی شاری «ئافیوون» و لە چەند شارێکا وەک «ئیسپارتە» و «دەنیزلیی» و «ئافیوون» ... ترس و لەرز بڵاو کرایەوە، دوای ئەوەی پەنجا و چوار کەس لە قوتابیانی نور گیران، تا ئەم بەندیخانەیش بۆیان ببێتە قوتابخانەی یووسفیی سێیەم.

تاوانی ئەمجارەیشیان هەر ئەو تاوانانە بوون کە جاران بە ناڕەوا دەدرانە پاڵیان و دادگاش بە بێتاوان دەری دەکردن، کە بریتیی بوون لە بەرپاکردن و پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی سیاسیی نهێنیی و هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی رژێمی دەوڵەت.

چەند جارێ دادگا کۆڕی بەست و مامۆستا و قوتابییەکانی برانە بەردەمی، تا ئەوە بوو سەرەنجام لە (٦)ی کانوونی یەکەمی (١٩٤٨)دا بیست مانگ بەندیی بۆ مامۆستا و ماوەی جۆرا و جۆریش بۆ قوتابییەکانی بڕایەوە..

بەڵام مامۆســــتا بەم بڕیارەی دادگـــا ڕازیی نەبوو، خــۆی و قوتابییەکانی بێتاوان دەزانی، چونکە ئەمە یەکەم جاریان نەبوو ئەوان بدرێن بە دادگا، بۆیە لە دادگای «تمییز»دا ڕەخنەی لەم بڕیارە گرت، تا ئەوە بوو بە پێی بڕیاری دادگای «دەنیزلیی»، کە لە (١٥)ی حوزەیرانی (١٩٤٤)دا دەرچوو بوو، ناڕەوایی بڕیارەکە دەرچوو و تاوانەکانیان لە سەر لابرا.

جارێکی تر کۆڕی دادگا بەسترایەوە تا بزانرێ داخۆ پێویستە بڕیاری دادگای «تمییز» جێ بەجێ بکەن یان نا ؟

تا بزانرێ تا چ ڕادەیەک تووشی زیان دەبن لە ئازادکردنی مامۆستایەک کە هیچ نیازێکی خراپی بەوان نیە.

بەڵێ، دادگا بە ئەنقەست ئەم مانگ و ئەو مانگ درێژەی دا بە دەرکردنی بڕیارەکەی و دواخستنی تا ئەو ماوەیەی، بە ناڕەوا دیاریی کرا بوو بۆ بەندکردنی مامۆستا، بی‌باتە سەر و کەڵک لە بڕیاری بێ‌تاوانیی وەرنەگرێ، هەر چەندە خۆیشی دانی پیا نابوو.

مامۆستا بیست مانگەکە لەم بەندی‌خانەدا مایەوە، بەڵام سزا و ئازارێکی زۆریان دا.. هەر چەندە پیریی و نەخۆشیی سەریان لێ‌دابوو، زستانەکەشی زۆر سارد بوو، لەگەڵ ئەمەشا خستیانە زیندانێکی زلەی چۆڵ و ڕووت و قووتەوە کە جێی شەست کەسی تیا دەبوویەوە، بێ ئەوەی زۆپای تیا بێ، بەفریش دەگەیشتە سەر شووشەی پەنجەرەکەی، زیاد لەمەش ژەهریان بۆ کردە خۆراکەوە، بەڵام خوای گەورە پاراستی.

بەندی‌خانەی «ئافیوون» تاوان‌بار و پیاوکوژی زۆری تیا بوو، کە زۆریان تەوبەیان کرد و بە ئامۆژگارییەکانی مامۆستا گەڕانەوە سەر ڕێگای ڕاست[1].

مامۆستا لەم بەندی‌خانەیەدا هەر ڕۆژێک ئەوەندەی مانگێکی بەندی‌خانەی دەنیزلیی سزای دەچەشت و، نەیان‌دەهێشت هیچ قوتابیەکی دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکات هەر بۆ ئەوەی تیا چێت و لە دەستی ڕزگاریان بێت، نەخۆشیی بە ڕادەیەک تەنگی‌پێ‌هەڵچنی بوو چەند ڕۆژێک نەی‌توانی هیچ بخوا، تا ئەوە بوو لە بەر کەم خۆراکیی تەواو بێ‌هێز بوو، لەگەڵ ئەمەشا مامۆستا لە نووسینی پەیامەکانی نوور ـ بە نهێنیی ـ نەکەوت. ئەوە بوو تیشکی پازدەهەمی نووسیی کە بریتییە لە پەیامی «الحجة الزهراء». ئەم پەیامە ئەو بەڵگانە دێنێتەوە کە بوون و تەنیایی خوا و، ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی موحەممەد ﷺ دەچەسپێنێ.

قوتابیەکانی مامۆستا لە بەندی‌خانەدا کاری هەمیشەییان بریتیی بوو لە نووسینەوەی پەیامەکان.. هەر کاتێ ـ چ شەو و چ ڕۆژ ـ لە ژوورەکەی مامۆستا نزیک دەکەوتنەوە بە وێنەی گرمەی هەنگ دەنگی ذیکر و تەسبیحات و صەڵەوات‌دانی دەهات.

---

(١) بۆ نموونە بەندییەک ناوی «طاهر» بوو پێی دەوترا قەساب، جەستەیەکی کەتەی هەبوو و هەموو بەندییەکان لێی دەترسان، دەست و پێی کۆت و زنجیر کرابوون، بە یەک سەردانی ژوورەکەی مامۆستا نوورسیی وەها گۆڕا سەرنجی هەموو بەندیی و پاسەوان و کاربەدەستەکانی ڕا کێشا.. بووە مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ و ئازاری کەسی نەدەدا و، نوێژەکانی بە جوانیی بە جێ دەهێنا.. گوفتاری کەم بوو و قوتابیانی نوورسیی خۆش دەویستن.



**مامۆستا نوورسی لەکاتی نوێژکردن**

ئەم وێنەیە لەکاتی لێ پرسرانی لە شاری «ئافیۆن» وەرگیراوە.



مامۆستا نوورسیی لەگەڵ چەند قوتابیەکیدا بۆ یەکێ لە دانیشتنەکانی دادگای ئافیوون دەڕۆن

بەینا و بەین لە بەردەم پەنجەرەکەیەوە تێ دەپەڕین و کە چاوی پێ دەکەوتن بەشێک لە پەیامەکەی لە ناو پاکەتە شقارتەدا بۆ دەخستنە خوارەوە تا ئەوانیش بە نهێنیی لە بەری بنووسنەوە.

جارێکیان «موحەممەد کایهان»ی بەڕێوەبەری بەندیخانەی «ئافیوون» ویستی داوێک بۆ مامۆستا نوورسیی بنێتەوە، بۆیە فەرمانی دا ئالأیەکی تورکیی، لە بیرەوەریی جەژنی سەربەخۆییدا، لە ژوورەکەی مامۆستادا داکوترێت، کە دەگونجێ مامۆستا بیدڕێنێ یا کەسانی تر لە سەر دڕاندنی هەڵ بنێ، ئەو کاتە ئەو بیانووەی دەست دەکەوێ کە گوایا نوورسیی بە سووکیی سەیری گەلی تورکیی دەکا.

بەڵام مامۆستا، مامۆستایانە، بەرەنگاری ئەم کارە بوو، بۆیە بۆی نووسیی:

« بەڕێوەبەری بەڕێز!

**سوپاست دەکەم بە داکوتانی ئالأیەک بە بۆنەی جەژنی سەربەخۆییەوە، میریی ئەنقەرە هەستی کرد ( لە کاتی بزووتنەوەی میللییدا) چاپکردن و بلاوکردنەوەی پەرتوەکەم «خطوات ستە» دژی ئینگلیز و دژی یۆنان لە کاریگەرییا بەرامبەر بە کاریگەریی فیرقەیەکی عسکەریی تەواو دەبێت، لە بەر ئەوە موصطەفا کەمال بە شفرە دوو نامەی نارد داوای ئامادەبوونی دەکرد بۆ ئەنقەرە تا پاداشتم بداتەوە، هەتا وتبووی: «ئێمە پێویستییمان بەم زانا پاڵەوانە هەیە». کەواتە مافی ئەوەم هەیە وێنەی ئەم ئالأیە لە ژوورەکەما دابکوترێت ».**

بەمە ژیرانە، چەپۆکێکی دا بە دەم و چاوی بەڕێوەبەردا.

دوای بەندکردنی نارەوا بۆ ماوەی بیست مانگ، مامۆستا لە (٢٠)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٤٩)دا خۆی و ژمارەیەک لە قوتابییەکانی بەردران و بە هاوەڵیی دوو پۆلیس برا بۆ ژوورێک کە بۆی ئامادە کرا بوو. بەڵام ئەم بەردانەی لە کاتی ئاساییدا نەبوو کە کاتژمێری دەی سەر لە بەیانییە، نەوەکو موسڵمانان خۆ پیشاندانێکی خۆشەویستیی مامۆستا پیشان دەن، بەڵکو لە کاتی بەرەبەیاندا بوو(٢).

---

(٢) سەرنجێکی پەیامی پیران، ئومێدی پانزەهەم، بدە.

# سەعیدی سێیەم

[ ١ ] پەروەردەی دڵان:

قۆناغی سەعیدی کۆن لەساڵی (١٩٢٦)دا کە لە بارلادا بە ڕەهەندەیی مایەوە، تەواو بوو. لەو قۆناغەدا دەی‌ویست خزمەتی ئیسلام لە ڕێگای سیاسەتەوە بکات. سەری دەدا لە سوڵتان و ئامۆژگاریی دەکرد و، لە ڕۆژنامەی «وولقان ـ گرکان» دا بابەتی سیاسیی توند و تیژی بڵاو دەکردەوە و، هەوڵی دەدا کار بکاتە سەر ڕای کۆمەڵەی «اتحاد و ترقي» و هەروەها... بەڵام ساڵانی نێوان (١٩١٨) و (١٩٢٦) بە قۆناغی گۆڕان‌کاریی دەژمێررێ بۆ «سەعیدی نوێ».

قۆناغی «سەعیدی دووەمیش» هەتا دەرچوونی لە بەندی خانەی ئافیوون» ساڵی (١٩٤٩) دەخایێنێ. ئەم قۆناغە بە وازهێنان لە سیاسەت دەست پێ دەکات و دەست‌دەداتە خزمەتی ئیمان، دوای ئەوەی قوتابخانە ئایینیەکان داخران و صەدەها مزگەوت کرانە ئەمبار و، تەویلە و، خان و، بنکەی لاوان.

لە ڕاستییدا دەست دایە کارێکی زۆر گەورە، بەڵام دەوڵەتیش نەی‌دەتوانی بە پێی یاسا تاوان‌باری بکات. بەڵێ پەیامەکانی نوور قوڵنگی ڕووخاندنی بینای کافریی و ئیلحاد و بێ‌ڕەوشتیی بوون، بەڵام ئەوە بوو مامۆستا لە شەش دادگادا بە بێ‌تاوان دەرکرا، هەرچەندە دەست‌بەرداری نەدەبوون و هەمیشە خەریکی ئازار و سزادانی بوون.

لە لایەکی ترەوە مامۆستا بە وردبینیە ئیمانییەکەی گەیشتبووە ئەو بڕیارە کە تا بەرەیەکی ئیمان‌دار بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە قووڵیی و بە چاکیی پێ نەگا کارکردن بۆ ئیسلام کارێکی بێ‌ئەنجامە. چونکە تێ‌نەگەیشتن لە ئیسلام بە شێوەیەکی ئیمانیی قووڵ، دەبێتە مایەی ناشیرین‌کردنی شێوەی ئیسلام و بەم چەشنە گەورەترین زیانی پێ دەگات.

قۆناغی سەعیدی سێیەمیش لە دوای دەرچوونی لە بەندی‌خانەی شاری «ئافیوون» دەست پێ دەکات هەتا ساڵی (١٩٦٠)، ساڵی ماڵ‌ئاوایی لەم جیهانە.

لەم ماوەیەدا وەزعی وڵات گۆڕا، گرژ سیاسیەکان کەوتنەوە کار دوای بەسەربردنی چارەکە صەدەیەک لە حوکمی تاقەپارت، لە ساڵی (١٩٥٠)دا

«پارتی دیموکراتیی» له هەڵبژاردندا سەرکەوتنێکی چاکی بە دەست هێنا و «پارتی گەلی کۆماریی» دایە دواوە کە بە ئاگر و ئاسن حوکمی وڵاتی دەکرد و سەراپای کاری دژایەتیی ئیسلام و کوژاندنەوەی ڕۆشنایی قورئان بوو.

لەم قوناغەدا مامۆستا لە نووسینی پەیامەکانی نوور وەستا، بەڵام دەستی دایە چالاکییەکی نوێ کە بریتیی بوو لە وانەوتنەوەی کۆمەڵیی بۆ پەیامەکانی نوور و، ئامۆژگاریی‌کردنی سیاسیی و کاربەدەستان تا شوێن ئیسلام بکەون و بۆی ڕوون دەکردنەوە کە تاقە ڕێگای سەرفرازیی بۆ مرۆڤ لە ڕێگای ئیسلامەوە دەبێت، بێ ئەوەی خۆی و قوتابیەکانی بە هیچ شێوەیەک تێکەڵ بە زۆنگاوی سیاسەت بن.

مامۆستا هەموو هەوڵ و کۆششێکی تەرخان کرد بۆ پەروەردەی دڵەکان و بەهێزکردنی ئیمان و شەرمی خوا و ترسی ڕۆژی قیامەت. بەردەوام قوتابیەکانیشی ئاگادار دەکرد کە بە کاری کەڵک‌بەخش و ئیجابییەوە خۆیان خەریک بکەن و ئاسایش و پێش‌کەوتن و حەسانەوەی گەل و وڵات دروشمیان بێت و بە هیچ شێوەیەک بە هێزی ماددیی و تۆڵەسەندن بیر لە مافی خۆیان نەکەنەوە و ئاوڕ بە لای پێرە دژەکاندا نەدەنەوە و خۆیان پێیانەوە خەریک نەکەن..

مامۆستا، دوای دەرچوونی لە بەندیخانەی «ئافیوون»، بۆ ماوەی دوومانگ لە خانوویەکی شاردا بە فەرمانی دەوڵەت مایەوە و هەمیشە دوو پۆلیس لە بەردەم دەرگاکەیدا دەوەستان بۆ موراقەبەی جم و جووڵی خۆی و هات و چۆی میوان و قوتابیانی. ئەم خانووەش لە ڕاستییدا شێوەیەکی تر بوو لە بەندکردن.

ســالان تێ‌دەپەڕین و تەمەنی مامۆســتاش بۆ پێشــەوە دەچوو، پیریی و بێ‌کەسیی و نەخۆشیی بێ‌هێز و لاوازیان دەکرد، بۆیە ناچار بوو ماوە بدا هەندێ لە قوتابیەکانی لە گەڵیا بمێننەوە و لە ژوورەکەی ترا بن و نەچنە ژوورەکەی لای هەتا داوایان نەکا، ئەمەش لە بەر پێویستیی پێیان بۆ خزمەت کردنی، بە پێچەوانەی سالانی پێشوویەوە کە بە تەنیا دەمایەوە و لە نوێژی شێوانەوە هەتا بەرەبەیانی ڕۆژی داهاتوو دەرگای دادەخست.

ئەوەی زیاتر دڵی مامۆستا و قوتابیەکانی خۆش دەکرد ئەوە بوو دوای بڕیارەکانی پاکیی و بێ‌تاوانیی کە هەمە جۆر دادگا دەریان کردن، ڕێگا درا بە بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور بە «ڕۆنیۆ»، بەمە هەزارەها دانە لە پەیامەکان چاپ دەکران و بە شار و دێهاتەکانا بڵاوەیان دەکرد و هەزارەها دۆستیان پەیدا دەکرد و شۆڵەی ئیمانیان لە نێو دڵەکانیانا دەگەشاندەوە.

## [ ٢ ] کەڵکی دادگا و بەندیخانە:

بەڵێ، سۆزی بەلێشاوی خوای گەورە ڕژا بە سەر ئیمانداراندا، بە ڕادەیەک کە بزووتنەوەی نوور توانیی باڵ بکێشێ بە سەر گەلی تورکییدا.. ئیتر کۆڕیان بۆ مامۆستا و قوتابیەکانی بەست نەیانتوانی ببنە کۆسپ و بەربەستێک لە بەردەم ئەم بزوتنەوەیەدا.. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو دادگا و کۆڕانە بوونە هۆیەکی تەواو کاریگەر بۆ بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور. چونکە دادگا و بڕیارەکانی لەو ڕۆژەدا ئاشکرا بوون و مامۆستاش هەڵوێستی خۆی و نەخشەی کارەکەی و ئامانج و مەبەستی پەیامەکانی بە جوانیی بە گوێی دادگادا دەدا و ڕوونی دەکردەوە کە بە ڕاستیی ئەم خەریکی خزمەتی ئایین و گەل و وڵاتە و ئەوانەش دژی دەوەستن ئامانج و مەبەستێکی گڵاویان هەیە. ئینجا قوتابیە دڵسۆزەکانی ئەم وتارانەی بەردەم دادگای مامۆستایان دەنووسییەوە و بە نهێنیی بە ناو خەڵکا بڵاویان دەکردنەوە.

لە لایەکی ترەوە میهرەبانیی بە لێشاوی خوای گەورە بە سەر قوتابیەکانیدا دەڕژا کاتێ ئەم کۆڕ و دادگا و بەندکردنانە دەبوونە مایەی قازانجێکی زۆر بۆیان، چونکە لە بەندیخانەدا قوتابیی شار و گوندە جیاجیاکان کۆ دەبوونەوە و ئــــەم کارەش دەبووە مایــــەی ناســــین و شــــارەزابوون .. دەبــووە مایەی دڵگەرمبوونیان و بۆیان دەردەکەوت پیاوە دڵسۆز و بەغیرەت و بەوەفاکانن وا بەند کراون و دەسەڵاتی وڵاتیش دیارە نۆکەری دەرەوەیە و، جڵەوی بەرەڵڵایی شل کردووە بۆ دز و جەردە و بەرتیل خۆر و داوێنپیسەکان، خواناسە بە ئیمانەکانیشی وا بەند کردووە تا لە هەموو چالاکیەکی کەڵکبەخش بکەون و نەهێڵێ بە ڕاستیی بۆ بەرژەوەندیی خاکی ئیسلام کۆشش بکەن.

ئەمە دەبووە مایەی بەهێزبوونی ئیمانیان و پتەوبوونی برایەتیی و تازەکردنەوەی پەیمان لەگەڵ پەروەردگارا تا دواهەناسەی ژیان لە سەر ڕێبازی قورئان بەردەوام بن. لە هەمان کاتا فێری پیتەکانی عەرەبیی دەبوون کە بە بۆنەیانەوە موسڵمان بە چاکیی شارەزای قورئان و حەدیث دەبێت.

بە ڕاستیی بەندیخانە بۆیان دەبووە قوتابخانەیەکی یوسفیی و بڕیارێکی مەردانەیان تیایا دەدا تا بە دڵ و بە گیان خزمەتی ئایینە پاکە ڕزگارکەرەکەیان بکەن.

ئەوە بوو دادگای «ئافیوون» بڕیاری دەست بە سەرا گرتنی پەیامەکانی نووری دەرکرد بوو، بەڵام دادگای تەمییز، بە پاڵپشتی دادگای جەزای گەورە لە دەنیزلیی، کە بڕیاری بێتاوانیی پەیامەکانی نووری دەرکرد بوو و ماوەی

خوێندنەوەیانی دابوو، ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە. بۆیە جارێکی تر دادگا کۆڕی بەستەوە بۆ پیاچوونەوەی ئەو باسە.

جا لە کاتێکا باسەکە ئەم دەست و ئەو دەستی دەکرد و جار لە دوای جار دادگا کۆڕی دەبەستەوە، حکوومەتی ئەنقەرە گۆڕرا و پارتی دیموکراتیی هاتە سەر کورسیی حوکمڕانیی و لە یەکەمین هەڵبژاردنی سەربەستدا لە تورکیا، لە ساڵی ۱۹۵۰دا، سەرکەوت و دەوڵەت چاوپۆشییەکی گشتیی لە ولاتا دەرکرد و ئیتر ئەو باسە پێچرایەوە.

دوای تەواوکردنی دوو مانگەکەی شاری «ئافیوون»، مامۆستا لەگەڵ هەندێ لە قوتابیەکانیدا، ڕۆیشت بۆ شاری «ئەمیرداغ» و دوو ساڵیش لەوێ مایەوە. دوای ئەوە چوو بۆ شاری «ئەسکی شەهر» ئەمەش لە ساڵی ۱۹۵۱دا یەکەمین سەردانی سەربەستیی بوو بۆی، چونکە پێش ساڵی ۱۹۵۰ نەیدەتوانیی بە سەربەستیی بۆ هیچ کوێیەک بڕوا. لەوێ بە دیتنی قوتابیە کۆنەکان و قوتابیە تازەکانی شاد بوویەوە.

لە میوانخانەی «یەڵدز» بۆ ماوەی مانگ و نیوێک لەم شارەدا مایەوە و هەمە جۆر بەشەکانی میللەتی موسڵمان دەستە دەستە سەریان لێ دەدا.

موسڵمانەکان بە حکوومەتی نوێ زۆر دڵخۆش بوون، چونکە وەک دوژمنێکی خوێنەخۆرەی موسڵمانانی دابوو بە زەوییدا، لە هەمان کاتا تا ڕادەیەک ماوەی بە هەندێ چالاکیی موسڵمانان دا و بانگی گێڕایەوە بۆ سەر شێوەی شەرعی، بۆیە مامۆستا بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ جەلال بایاری سەرۆک کوماری تازە نارد و تیایا ئاواتی خواست خوای گەورە کۆمەکیی بکا بۆ خزمەتی ئیسلام و، ئەویش بە بروسکەیەکی سوپاس وەلامی دایەوە.

# دادگای « ئەستەمبووڵ »

[ ١ ] ڕابەری لاوان:

دوای تەواوبونی ئەو ماوەیە کە مامۆستا نوورسیی لە «ئەسکی شەهر»دا مایەوە، بەرەو شاری «ئیسپارتە» کەوتە ڕێ، کە حەفتا ڕۆژ تیایا مایەوە و چاوی بە قوتابیەکانی کەوت و بیرەوەریی سالأنی ڕەهەندەیی دەهێنایەوە یاد.

لەو ماوەیەدا یەکێ لە قوتابیەکانی لە «ئەستەمبووڵ» پەیامی « ڕابەری لاوان »ی بە پیتی نوێ چاپ کرد(١).

ئەمە بووە هۆی ئەوە دەعوای لە دژ تۆمار بکرێت بە بیانووی ملپێنچیکردنی بۆ مادده (١٦٣)ی دەستووری تورکیی، ئەو ماددەیەی کە قەدەغەی هەموو چالاکییەک دەکات کە مەبەستی بنیادنانی دەوڵەت بێ لە سەر بناغەی ئایین.

مامۆستا بانگ کرا بۆ «ئەستەمبووڵ» تا لە بەر دەم دادگای جەزای گەورەدا لە ڕۆژی (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٢)دا ئامادە بێت.

بەرەو «ئەستەمبووڵ» کەوتەڕێ.. ئەو شارە جوانەی کە بیست و نۆ ساڵ بوو لێی دوور کەوتبوویەوە.. لەوێ لە میوانخانەی «ئاق شەهر» مایەوە.

بەر لەوەی ژیانی ڕەهەندیی دەست پێ بکات، چەند ساڵێکی لە ئەستەمبووڵ بە سەر برد بوو کە پڕی بوو لە دۆستی گیانی بە گیانیی، بۆیە هەر چەندە لە کاتێکی زۆر ساردا و ڕێگا دوور و درێژ و خۆیشی پیریی بێهێزی کرد بوو، زۆر بە تاسەوە بوو بۆ سەردان لە «ئەستەمبووڵ».

بە گەیشتنی مامۆستا، دۆست و خۆشەویستان بە لێشاو هاتن و سەریان لێ دا.. بەیەکگەیشتنەوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕووی دا.. بیرەوەریی جۆرا و جۆر و زۆر و دوور دەهاتنەوە یاد. ئـــەو بیرەوەرییانەی کـــە تێــکڕا جیـهاد و تێکوشان بوون لە پێناوی خوا و ئایینی پیرۆزی خوادا.

هەروەها قوتابیانی نوور و لاوی ئیمانداری زانکۆ هەواڵی هاتنی مامۆستایان زانی، زۆر زۆر پەرۆشی بە دیدارشادبوونی ڕابەری بەرز و بەرێزیان بوون، ئەو ڕابەرەی کە بە درێژایی تەمەنی، لە سەر ئایینی ئیسلام، لە مەینەت و ئازارا ژیاوە و، لە سەختترین هەڵوێستا و لە بەر تەوژمی تیژترین

(١) پەیامی (ڕابەری لاوان) کراوە بەکوردی و، خوایاربێ لە دەرفەتێک دا بڵاودەکرێتەوە.

گێژەڵووکەدا خۆی گرتووە و چرای هیدایەتی بەرز کردۆتەوە بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک ساردیی ڕووی تێ کا و هەڕەشە و گوڕەشە کار بکاتە سەر وزەی.

لاوی ئیماندار زۆر بە تاسەوە بوون ئەو مامۆستا بەڕێزەیان ببینن کە ساڵەهای ساڵە پەیامەکانی بە نهێنیی دەخوێننەوە و دەستا و دەستی پێ دەکەن، وا ئێستا لە سەر پەیامێک، کە دەستی لاوان دەگرێت و بەرەو ئیمان بانگیان دەکات، بانگ کراوە بۆ بەردەم دادگا.

جگە لە دۆستان و قوتابیان خەڵکێکی زۆر و زەبەندە هاتن بۆ دیتنی ئەو پیاوەی کە دەنگ و باسی سەرانسەری وڵاتی گرتۆتەوە و ماوەی چارەکە صەدەیەکە دادگا و بەندیخانەکانی تورکیا مەنزڵیەتی.. ئەو پیاوەی کە بە تاقی تەنیا توانیی گۆڕانْ بخاتە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە و لەو کاتە ناسکەدا ڕاستییە ئیمانییەکان بگێڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵ..

## [ ٢ ] یەکەم دانیشتنی دادگا:

لە ڕۆژی (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ دا دادگا کۆڕی بەست و مامۆستا هات و صەدەها لە قوتابیانی نوور دەوریان دابوو. هەندێکیان چوو بوونە ژێر باڵی و ئەوانیشیان لە پاڵ پاڵێنی قەڵەباڵغیی دەیانپاراست.

هۆڵی دادگا پڕ بوو بوو لە خەڵکیی کە هاتبوون بۆ ئاگادار بوون لە ئەنجامی دادگا و، بۆ بینینی ئەو مامۆستایەی کە ساڵەهای ساڵە دەوڵەتی تورکیای پەشۆکاندووە.

قەڵەباڵغیی هەموو کوێن و قوژبنێکی دادگای داگیر کرد.. شەقامەکانیش پڕ بوون.. لە شوێنی تاوانبارانا مامۆستای بێتاوان دانیشت.. «مدعي عام»یش دەستی کرد بە خوێندنەوەی ڕاپۆرتی ئەو خەبیرانەی کە سەرنجدانی وردی پەیامی «ڕابەری لاوان» خرابوویە ئەستۆیانەوە، دوای ئەوە پرسیار لە مامۆستا کرا.

کورتەی ڕاپۆرتی خەبیران بەم شێوەیە بوو:

*« دانەر لە پەیامەکەیدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیری ئایینیی دەدات و بە هۆی ئەم بیرانەوە هەوڵ دەدا نەخشەی ڕێگایەکی دیاریی‌کراو بکێشێ بۆ لاوان و، داوا لە ئافرەتان دەکا خۆیان داپۆشن و بە جل و بەرگێکەوە کە لەشیان دەرکەوێ نەگەڕێن چونکە ئەوە دژی فیترەتە و پێچەوانەی ئیسلام و ڕەوشتە قورئانیەکانە هەروەها دانەر داوای خوێندنی ئایین دەکات، بەمە پشتگیریی لە دامەزراندنی نەریتی دەوڵەت دەکا لە سەر بناغەی ئایینیی... هتد ».*

دوای ئەوە مامۆستاش بۆ پەرچدانەوەی ئەو وتانە هەڵسا و ئەمە کورتەی وتارەکەیەتی:

سیی و پێنج ساڵ لە تەمەنی نموونەیەکی چاک دەدا بە دەستەوە بە بێگومان بە هیچ شێوەیەک لە سیاسەتا ئیشی نەکردووە و، هیچ پەیوەندییەکی بە هیچ کاروبارێکی دونیایی، یا تەوژمێکی زیانبەخشەوە نەبووە.

ئەوەی بە لایەوە گرنگە و بیری پێوە خەریکە ئەوەیە خزمەتی قورئان بکات و ڕاستیە ئیمانیەکان ڕوون بکاتەوە و هەوڵی داوە و ئێستاش بە هەموو هێزێکیەوە هەوڵ دەدا بۆ ڕزگارکردنی ئیمان.. بڕیارەکانی بێتاوانیی کە لە دادگای جۆرا و جۆرەوە بۆی دەرچوون بەڵگەی تەواو لە سەر ئەوە بە دەستەوە دەدەن ـ بەڵام لە بارەی چاپکردنی پەیامی «ڕابەری لاوان» لە لایەن لاوانەوە، پێویستە مایەی شادیی و ئاسوودەیی بێت، چونکە ئەم پەیامە هەوڵ دەدا لاوان بە کوڕ و کچەوە، لەو ڕێبازە زۆر و زەبەندانە ڕزگار بکات کە بۆ ڕووخاندنی بینای کۆمەڵ و کلۆرکردنی جەستەی هەوڵ دەدەن.

بەم شێوەیە یەکەم دانیشتنی دادگا کۆتایی پێ هات و بڕیار درا لە نۆزدەی شوبات دا بۆ جاری دووەم دانیشنەوە.

[٣] دانیشتنی دووەم:

لە دانیشتنی دووەمدا قەڵەباڵغێکی زیاتر دروست بوو، بە ڕادەیەک بەرگریی کردن و گەڕاندنەوەی خەڵکیی بۆ دواوە لە توانای پۆلیسا نەما و، کاتێ مامۆستا گەیشت و قوتابیەکانی دەوریان دابوو خەڵکەکە چەپڵەیان لێ دا.

لە ناو پاڵپاڵێن و قەڵەباڵغییدا دادگا کاری بۆ نەدەچوو بەڕێوە، بۆیە سەرۆکی دادگا ڕووی کردە خەڵکەکە و پێی وتن:

ئەگەر مامۆستاتان خۆش دەوێ ماوەمان بدەن تا بتوانین لە سەر مەحکەمە بەردەوام بین.

بەم داوایە خەڵکەکە کشانە دواوە و کاری دادگا دەستی پێ کردەوە. ئەوە بوو خاوەنی ئەو چاپخانەیە کە پەیامەکەی چاپ کردبوو بانگ کرا و گوێیش بۆ شایەتیی پۆلیس گیرا، دوای ئەوە مامۆستا هەڵسا و ڕەخنەی خۆی پێشکەش کرد دەربارەی نووسراوی خەبیرەکان.

کە نوێژی عەصر هاتە پێشەوە، مامۆستا داوای کرد ماوەی بدەن نوێژەکەی بەجێ بێنێ، ئەوە بوو داواکەی وەرگیرا و، سەرۆکی دادگا بڕیاری کۆتایی هاتنی دانیشتنی دووەمیشی دا.



ساڵی ١٩٥٩ مامۆستا تەشریفی بۆ ئەستەمبووڵ برد و لە بەر دەرگای ئەو ئوتێلەدا کە دابەزیوە ئەم وێنەیەی گیراوە.

ـر



مامۆستا «نوورسیی». لە رۆژی سێشەممەی ١٩/شوباتی/١٩٥٢ دا لە ئەستەمبوولْ لەو دادگایەدا کە بۆ پەیامی (رابەری لاوان) گیرا، دیفاع دەکات.

[ ٤ ] دانیشتنی سیٚیەم:

لە پێنجی مارتی ١٩٥٢ دا دانیشتنی سیٚیەم بوو کە دەوڵەت صەدەها پۆلیسی لە بەردەم دادگا و ناوەوەیدا دانا تا بتوانیٚ دەست بە سەر بارودۆخا بگریٚ و، ئەو هەموو قەڵباڵغیەدا کە قوتابیان و دۆستانی مامۆستا دروستی دەکەن سەروکاریی بکات.

سەرەتا دادگا گوێی بۆ شایەتیی ئەو قوتابیەی زانکۆ گرت کە پەیامەکەی چاپ کردبوو، ئەوقوتابی‌یە دەری بڕیی زۆریٚ لە نووسینەکانی خۆرئاوا و خۆرهەلاٚتی خوێندۆتەوە، بەلاٚم کە پەیامەکانی نووری دەست‌کەوتوون، بۆی دەرکەوتووە کارێکی چاک دەکەنە سەر مێشک و بیر و گیان و ویست و ڕەوشتی مرۆڤ و کە بۆی دەرکەوتووە پەیامی «ڕابەری لاوان» پارێزگاریی ڕەوشتی لاو دەکات، چاپی کردووە و بە خزمەتێکی نیشتمانیی دادەنیٚ و هیچ تاوانێکی تیا نیە.

دوای ئەوە پارێزەرەکانی مامۆستا بەرگریەکانی خۆیان پێشکەش کرد و بەرچی ئەو تاوانانەیان دایەوە کە خڕابووڕنە ئەستۆی.

لە دواجارا سەرۆکی دادگا ڕووی کردە مامۆستا و پرسیاری لیٚ کرد:

ـ ئایا شتی تر هەیە بی‌ڵێیت، زیاد لەوەی کە وتت ؟

ـ **تکام وایە ڕێگام بەن یەک وشە زیاد کەمٚ.**

ـ فەرموون.

ـ **من شایانی ئەو ستایشە نیم کە پارێزەرە بەڕێزەکانم باراندیان بە سەرما. چونکە من تەنها خزمەتکارێکی کۆڵەواری قورئان و ئیمانم و، جگە لەمە هیچی ترم پیٚ‌نیە بی‌ڵێم.**

لەدواجارا دادگا بڕیاری خۆی دەرکرد و مامۆستا بیٚ‌تاوان دەرچوو.

ئەوە بوو لە ساڵیٚ ١٩٦٠ دا سەرۆکەکانی کوودەتا سەربازییەکە سەرۆکی دادگا «نفعي دميرلي اوغلو» یان سزا دا لە سەر ئەوەی چۆن سەعید نوورسیی بیٚ‌تاوان دەرکردووە ؟

ئەویش ڕوونی کردەوە کە بە چاکیی لە باسەکە کۆڵیوەتەوە و گوێی گرتووە بۆ شاهێدەکان و، ئەو بڕیارەشی داوە کە ویژدانی هەڵی گرتووە.

# دادگای « صامسۆن »

## [ ١ ] بیانووی تازە و دادگای نویێ:

مامۆستا لە دادگای «ئەستەمبوڵ» بە بیێتاوان دەرچوو، دوای ئەوە سەرێکی لە «ئەمیرداغ» دا بۆ چاوپیێکەوتنی قوتابیی و دۆستەکانی ئەوێی.

لە ڕۆژێکی ڕەمەزانا مامۆستا بە تەنیا لە شار دەرچوو بۆ گەڕان بەو کێڵگانەی قەراغ شاردا، بیێ ئەوەی بزانیێ عەریفێک و سیێپۆلیس وان بە دوایەوە. ڕێیان بە مامۆستا گرت بۆ شەڕپیێفرۆشتنی تا شەپقە بکاتە سەری.. کە هێنایانەوە بۆ پۆلیس‌خانە، نارەزایی خۆی دەربڕیی بۆ ئەم هەڵوێستە ناشیرینە و، سکالایەکیشی نارد بۆ وەزارەتی داد و ناوخۆ لە پایتەخت و، وێنەیەکیشی لەم نامەیە نارد بۆ یەکیێ لە قوتابییەکانی لە «ئانقەرە» تا سەرپەرشتیی باسەکە بکات لە لای کاربەدەستان.

لە «ئانقەرە» هەندیێ لە قوتابیانی نوور بڕیاریان دا وێنەیەکی ئەم سکالایە بنێرن بۆ ڕۆژنامەیەکی ئیسلامیی کە لە « صامسۆن» بە ناوی « بیوگ جهاد، گەورەترین جیهاد » دەر دەچوو، تا بلاوی بکاتەوە.

ناحەزانی ئیسلام زۆر داخ‌لەدڵی ئەم ڕۆژنامەیە بوون، بۆیە لە بیانوو بوون بۆی، تا ئەوە بوو بەڕێوەبەری لیێپرسراوی ڕۆژنامە و یەکیێ لە لیێپرساوە چالاکەکانی ـ کە موصطەفا صونگوری قوتابیی نوور بوو ـ گیران و دران بە دادگای « صامسۆن » و بڕیاری بەندکردنیان دەر چوو، بەلاّم لە دادگای «تمییز» دا ئەم بڕیارە درایە دواوە و بڕیاری بیێتاوانییان دەر چوو.

دوای ئەمە بەزمێکی تر بۆ مامۆستا نرایەوە، ئەوە بوو دەعوایان لە سەر نووسیی بە هۆی باسێکەوە کە لە ڕۆژنامەی «گەورە ترین جیهاد» دا و لە ژێر ناونیشانی « اکبر برهان ـ گەورەترین بەڵگە » دا بلاو کرابوویەوە، داوایان لیێ کرد لە بەردەم دادگای «صامسۆن» دا ئامادە بێت، بەلاّم مامۆستا زۆر نەخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشا تەمەنی لە هەشتا ساڵییدا بوو. جا لە پزیشکایەتیی ناحیەی «ئەمیرداغ» و شاری «ئەسکی شەهر» نەخۆشییەکەی سەلماند کەوا ناتوانیێ سەفەر بکا. بەلاّم دادگای «صامسۆن» هەر سوور بوو لە سەر ئامادەبوونی.

مامۆستای ئازیز ناچار بەرەو «ئەستەمبووڵ» کەوتە رێ تا لەوێیشەوە بڕوا بۆ صامسۆن. کە گەیشتە «ئەستەمبووڵ» نەخۆشییەکەی زیاتر بوو و نەی‌توانی، لـــە ســـەر سەفەرەکەی بەردەوام بێت، بۆیە لـــە دەســـتەی تەندروستیی لە «ئەستەمبووڵ» بەڵگەنامەیەکی پزیشکیی وەرگرت و ناردی بۆ دادگا تا ئاگادار بێ مامۆستا بە هیچ هۆیەکی گواستنەوە توانای سەفەری نیە، کەچی هێشتا «مدعي عام» هەر بە توندیی ملەجەڕەی ئەکرد و ســـوور بوو لـــە ســـەر ئامادەبوونی مامۆستا، هەر بۆ ئەوەی بە ئەنقەست ئازاری بدا. بەڵام خوای گەورە بەزەیی بە مامۆستادا هاتەوە و دادگا بە ڕای «مدعي عام» ی نەکرد و بڕیاری دا دادگای «ئەستەمبووڵ» لە جیاتیی دادگای «صامسۆن» لێی بپرسێتەوە.

ســـەرەنجامی ئەم جارەش بێ‌تاوان دەرچوونی مامۆســـتا بوو چونکە لە نووسراوەکەیدا هیچی تیا نەبوو کە جێی ڕەخنە بێ.

مامۆستا نوورسیی نزیکەی سێ مانگ لە «ئەستەمبووڵ» مایەوە کە زۆربەی ئەو ماوەیەی لە ماڵی قوتابییەکی زۆر نزیکیا بردە سەر.

## [ ٢ ] ئاهەنگی ناوازە:

ئەو ساڵە ساڵێکی ناوازە بوو، شاری «ئەستەمبووڵ» خۆی ئامادەی بیرەوەریی پێنج‌صەد ســـاڵەی رزگارکردنی دەکردەوە کـە لـــە ســـاڵی ١٤٥٣ز دا بە سەرکردایەتیی سوڵتان «موحەممەدی فاتح» رزگار کرا.

بەو بۆنەوە ئاهەنگێکی گەورە ساز کرا و مامۆستا نوورسییشی بۆ بانگ کرا و لە ئاهەنگەکەدا چاوی بە پەتریرکی ڕۆم «ئاثینۆگوراس» کەوت و ئەم وت و وێژە لە نێوانیانا ڕووی دا:

**- دەگوترێ ئەهلی ڕزگاریی بن لە ڕۆژی قیامەتا ئەگەر ئیمان بە ئایینی نەصرانیی راســـتەقینە بێنن ، بـــەو مەرجەی دان بنێن بە پێغەمبەرایەتیی سەردارمان موحەممەدا ﷺ و دان بنێن بە قورئانی پیرۆزدا کە پەڕاوێکە لای خواوە هاتووە.**

- من دان بەوەدا دەنێم.

**- چاکە، جا ئایا ئەمە لە بەردەم سەرۆکە ڕوحانییەکانی تردا ئاشکرا دەکەن ؟**

- بەڵێ من ئەوەم پێ وتوون، بەڵام ئەوان وەری ناگرن !

# گەشتی بیرەوەریی

[ ١ ] بۆ بارلای خۆشەویست:

دوای بەسەربردنی سێ مانگ لە «ئەستەمبوول» دا، مامۆستا دڵی هاتە سەر ئەوەی سەردانێک بکا بۆ ئەو شـــارانەی کە چەند ماوەیەک تیایانا مابۆوە و نەی‌دەتوانی ئەو بیرەوەرییانە لە یاد بەرێتەوە، بۆیە سەری لە «ئەمیرداغ» دا و دوای ئەوە «ئەسکی شەهر» و لەوێیشەوە بۆ «ئیسپارتە» کە هەشتا ڕۆژی تیا مایەوە. لە «ئیسپارتە»وە لەگەڵ دەستەیەک لە قوتابیەکانیا بەرەو شاری بیرەوەریی.. شاری «بارلا» ی خۆشەویستی کەوتەڕێ.. ئەو شارەی کە یەکەم قوتابخانەی نووری تیا دامەزرا و یەکەم شوێن بوو پەیامەکانی نووری تیا بنووسرێت.. ئەو شارەی کە بە ڕەهەندەیی تیایا ماوەتەوە و خوای گەورە ئەو ڕۆژە سەختانەی کردە ڕۆژانی فەڕ و پیرۆزی بۆ بانگەکەی و ڕۆژانی شیرین و بە تام لە ناو کرۆکی دڵیا، بە بۆنەی ئەو خواپەرستییەی کە تیایا بە جێی هێنا..

مامۆستا دوای بیست ساڵ لە بەجێ هێشتنی ئەم شارە خۆشەویستەی، کە ئەو ماوە زۆرەی بە ڕەهەندەیی و بەندیی و بینینی دادگا و جۆرەها بەڵاو تاقی کاریی تیا بردەسەر، وا ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ ناوی.

گەڕایەوە، بە سوپاسێکی زۆری خوای گەورەوە دوای بەراوردکردنی ئەمڕۆی ئیمان‌داران و تێ‌گەیشتوان لەگەڵ ئەو ڕۆژەدا کە دوور خرابوویەوە بۆ «بارلا» و کەسێ نەی‌دەوێرا سەلامێکی لێ بکا(١)..

وا ئەمڕۆش هەندێ لە بەرهەمی بانگەوازەکەی دەوریان داوە.

وا ئەمڕۆش پەیامەکانی دڵی گەنج و لاوی سەرانسەری تورکیایان ڕاکێشاوە و بوونەتە شەیدای نووری قورئان و، بەوپەڕی شانازییەوە سەروماڵی بە قوربان دەکەن و، بە پەروەردەی نووری قورئان بوونەتە خاوەنی دەم و چاوێکی

(١) بەڵێ، بائەمە لەبەرچاوی هەموو قوتابی‌یەکی قورئاندا بێ.. هەرکاتێ بە تاقی تەنیاو لە غەریبی‌دا دەست بە کاردەکات، باساردیی بە دڵیا نەیەت و، پشت بە خوای‌گەورە ببەستێ و، دەست بە نووری قورئانەوە بگرێ و، بەئارام بێ لە سەر ساردیی خەڵک، چونکە بە ڕاستیی خەڵک درەنگ لە نووری قورئان دەگەن!!

گەشاوەی بریسکەدار، ئەمەش بە بۆنەی ئەو خۆشەویستییەی کە لە قووڵایی دڵیانا بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ جێی بۆتەوە.

دانیشتوانی «بارلا»ش کە بیستیان وا مامۆستای ئازیز و خۆشەویست وەفاداریی خۆی بە جێ دێنێ و سەریان لێ دەدا، خۆشەویستیی و پەیوەندیی برایەتیی لە پێناوی ئیسلامدا دڵی کەمەندکێش کردووە تا سەر لە خۆشک و برایانی بداتەوە. بۆیە بە ژن و پیاو و کوڕ و کچ و پیر و گەنجەوە لە ماڵ دەر چوون بۆ پێشوازیی لێکردنی، بگرە مناڵە وردیلەکانیش کە لە کەس و کاریانەوە دەنگ و باسی ماموستایان بیست بوو، لە خۆشیانا هەڵ دەپەڕین و دەیان وت:

ـ *مامۆستا هات... مامۆستا هات!*

مامۆستایان بە چاو نەدی‌بوو، بەڵام لە دایک و باوکیان هەواڵیان بیست بوو، بەوە خۆشەویستیی پێشەوای ئازیز چووبووە کرۆکی دڵە ناسکەکەیانەوە.

مامۆستا بەرەو ماڵەکەی خۆی ڕێی گرتەبەر، ئەو ماڵەی کە بوو بە یەکەم قوتابخانەی نووریی و زیاتر لە هەشت ساڵ تیایا مایەوە.. بەر لەوەی بگاتە ماڵەکە، بە بەردەم ماڵی موصطەفا چاویشـی قوتابیی دڵـــسـۆز و بـــە غیرەتیا تێپەڕیی، کە ژوورە سەرنەگیراوەکەی لە تەختە لە نێو لق و پۆپی درەختەکەی بەردەم ماڵەکەیدا، بۆ دروست کرد بوو.

دای بە بەردەم ماڵی قوتابیەکەیدا و قوفڵێکی گەورەی لێ درا بوو چونکە موصطەفای بەوەفا لە ساڵی ١٩٣٧ دا کۆچی دوایی کردبوو، کە لەو کاتەدا مامۆستا لە «قەستەموونیی» ڕەهەندە بوو، بێ ئەوەی ئیتر چاوی پێ بکەوێتەوە دوای دەرچوونی لە «بارلا».

فرمێسکەکان بە خوڕ دەهاتنە خوارەوە و کوڵیان تەڕ دەکرد و دڵخۆشی بە دیدار شادبوونەوەی قیامەت بوو.

لە دواجارا گەیشتە ماڵە پێشووەکەی خۆی، یەکەمین قوتابخانەی نوور، کە درەختە خۆشەویستەکەشی لە بەردەمیا قنج ڕاوەستا بوو، وەک ئەویش بە سەری بەرزەوە، دوای سەرکەوتنی ئیمان و بڵاوەبوونەوەی و ڕۆشن کردنەوەی بۆ دڵی لاوانی وڵات، بە خێرهاتنەوەی مامۆستا بکات و ئەوپەڕی شادمانیی و بەختەوەریی خۆی دەرخات کەوا بەشداریی لە خزمەتی قورئان و ئیماندا کردووە کە هەشت ساڵی ڕەبەق هاودەمیی مامۆستای لە ذیکر و خواپەرستییەکەیدا کردووە.

مامۆستا دڵی پڕ بوو لە سۆز و داوای کرد لە دانیشتوان و لە قوتابیەکانی کەبمێ بە تەنیا بەجێی بێڵن..

با کەمێ تەنیا بمێنێتەوە تا چاک بیرەوەریەکانی کاتی تەنیایی و بێ‌کەسیی بێتەوە یاد.

ئەو کاتەی کە ئەو درەختە هاودەم، بەڵکو هەموو کەسێکی بوو، کە کۆمەک و پشتیوانی بوو لە خواپەرستییەکەیدا.

لێی چووە پێشەوە و وەها باوەشی پیا کرد وەک باوەش بە خۆشەویست‌ترین کەسیدا بکا کە ماوەی بیست ساڵ لێی بڕا بێ.. باوەشی پیا کرد و دەستی دایە گریان بە سەریا، گریانێکی بە کوڵ..

ئەم درەختە پارچەیەک بوو لە ژیانی.. لە بیرەوەرییەکانی، چونکە ژیانی لەگەڵا بە سەر بردووە، ئەمەیە وەفاداریی کـــە ئیســـلامی بـــێ‌گەرد لـــە دڵی ئیمان‌دارا دەی‌ڕوێنێ!

چەند شەوی لە نێو لق و پۆپیا بە سەر بردبێ بە شەونوێژ و ذیکری خواوە؟

چەند کاتی بە سەر بردبێ بە نووسینی پەیامەکانی نوورەوە تێکەڵ بە تەسبیحاتی دڵڕفێنی گەڵا و باڵندەکان کە جوان‌ترین دەنگ و ئاوازیان لە دەوریا سازدەکرد؟

چەند شەوی زستانی دوور و درێژ و تاریکی لە ژوورەکەیا، دوای خەوزڕان، بە سەر بردبێ، بێ‌کەس و بێ‌هاودەم جگە لە دەنگی ڕەشەبا کە لق و پۆپی درەختەکەی دەلەراندەوە و دەنگێکی خەماویی لێ دروست دەکرد، یان دەنگی دڵۆپە بارانەکە کە ئەکەوتە سەر گەڵاکانی و دەنگێکی تیژ و بەتەوژمی لێوە دەهات؟

بەم شێوەیە ئەم درەختە بە زستان و بە هاوینا دەورێکی هەبوو لە ژیانی مامۆستادا، ئەو ژیانەی کە بە غەریبیی و بێ‌کەسیی و تەنیایی پێچرابۆوە.

ئەم درەختە هاوەڵ و هاودەمە بیست ساڵە لێی براوە. وا ئێستا زیاتر لە هەموو دۆستان و خۆشەویستانی بارلا دڵی بۆی بێ‌تاقەتە، بۆیە خۆی پێ نەگیرا و باوەشی پیاکرد و بە کوڵ دەستی دایە فرمێسک‌ڕشتن .. فرمێسکی بێ‌تاقەتیی و خۆشەویستیی.

دوای ئەوە سەرکەوتە سەرەوە بۆ ژوورەکەی، ماوەی دوو سەعاتێک بە تەنیا مایەوە. هەر لە بەرەوە بیرەوەریی دەهاتنە یادی و بۆیان دەگریا.. بە کوڵ دەگریا بۆ ئەو کاتە نوورانیانەی کە لەو ژوورەدا زیاتر لە هەشت ساڵ بە سەری بردن. خەڵکەکە و قوتابیەکانیشی کە دەوری خانووەکەیان دا بوو گوێیان لە گریانەکەی مامۆستا بوو، ئەوانیش بەخوڕ فرمێسک لە چاویان دەهاتە خوارەوە.

## [ ٢ ] جەژنی پەیامەکانی نوور:

ئەوەبوو دادگای «ئافیوون» لە ساڵی ١٩٤٨ دا لیژنەیەکی پێک هێنا لە شارەزایان بۆ سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی پەیامەکانی نوور و، دەربڕینی ڕایان لە سەری کە ئایا شتێکیان تیایە بە پێی یاسای تورکیی تاوان بێت یان نەء ؟

ئەم دادگایە هەشت ساڵی خایاند تا ئەوە بوو لە ٢٥ی مایسی ١٩٥٦ دا بە پێی ئەو ڕاپۆرتەی کە لە لیژنەی خەبیرانەوە درا بوو، بڕیار درا کە ئەم پەیامانە هیچ شتێکیان تیا نیە دژ و پێچەوانەی یاسا بێت.

ئەم بڕیارە ئەوەی دەگەیاند پەیامەکانی نوور دەگونجێ چاپ بکرێن و بە ئاشکرا بڵاو بکرێنەوە ئەوە بوو پاش ئەم بڕیارە قوتابیانی نوور مەردانە قۆڵیان لێ هەڵماڵیی و چاپخانەکانی «ئەستەمبوول» و «ئانقەرە» و «صامسۆن» و «ئەنطالیا» یان خستە کار بۆ چاپکردنی پەیامەکان، بەڵام دەبوایە مامۆستا خۆی سەروکاریی پرۆڤە و ڕاست کردنەوەی هەڵە چاپییەکانی بکردایە نەوەکو هەڵەیان تیا روو بدات.

مامۆستا زۆر دڵخۆش بوو بە چاپکردنی پەیامەکان تا ئیتر، قوتابیان ئەوەندە ماندوو نەبن بە دەست نووسینەوە، بۆیە دەیوت:

**« ئائەمە جەژنی پەیامەکانی نوورە، من چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە بووم، کەواتە کاری سەرشانم تەواو بوو و بەم زوانە کۆچ دەکەم ».**

ئەوەی لێی دەترسا بە پێی پێویست پەیامەکان بە بێ دەستکاریی بڵاو نەبنەوە. ئێستا کە چاپ دەکرێن، خوا کۆمەک بێت کاری خۆیان بە جێ دێنن لە تازەکردنەوەی کاروباری ئیسلام و ئاشنا کردنەوەی دڵەکان بە ئیمانی ڕاست و «تەواو».

دەترسا سپاردەکەی سارشانی نەگات بەڵام وا ئەمڕۆ ـ سوپاس بۆ خوا ـ گەیاندی.

ئەگەر مامۆستا بۆ کارێ دەرچوایە بە پەلە دەگەڕایەوە و بە قوتابییەکانی دەوت؛ «دەبێت ئێستا مەلزەمەکان گەیشتبن، بۆمان نیە وازیان لێ بێنین چاوەڕوان بکەن، دەبێ خێرا بگەڕێنەوە ». واتە: پێویستە بە زووترین کات لە چاپ بدرێن و دوا نەکەون.

ئەمە ئامۆژگارییە بۆ موسڵمانەکان تا:

یەکەم: بە چاکیی نرخی پەیامەکان بزانن و، ئەوەش بزانن کە ئەم پەیامانە دەرمانی دڵەکانیانن بۆ پاکبوونەوە و خۆتەسلیمکردن بە خوا و بە ڕاستیی شوێنکەوتنی ئیسلام.

دووەم: بە هیچ شێوەیەک کەمتەرخەمیی نەکەن لە بڵاوکردنەوەیانا ، هەموو کەسێ بە پێی توانا و لێهاتنی خۆی.

ساڵی ١٩٥٧ هاتە بەرەوە و ساڵ بە ساڵ مامۆستا پیر و لاواز دەبوو.

ئەوە بوو هەڵبژاردنێکی گشتیی لە تورکیادا کرا و دوو پارتی سەرەکیی لە سەر حوکم بەرابەرکێیان بوو. کە ئەوانیش پارتی دیموکراتیی حوکمبەدەست و پارتی گەلی بەرهەڵستکار لەگەڵ چەند پارتێکی تری بچووک.

جا هەر چەندە پارتی دیموکراتیی پارتێکی ئیسلامیی نەبوو، بەڵام ئەو سەربەستییەی کە باڵی بە سەر تورکیادا کێشا دوای وەرگرتنی کورسیی لە لایەن ئەم کۆمەڵەوە و نەمانی دژایەتیی درندانە دژی ئیسلام، مافی خۆی بوو موسڵمانان پشتگیریی لێ بکەن تا سەرکەوێ.

لە لایەکی ترەوە مامۆستا وازی لە ژیانی سیاسەت هێنا بوو و کۆمەڵەیەکی سیاسیی پێک نەهێنا بوو، لەگەڵ ئەوەشا بڕیاری دا لەو ڕۆژەدا دەنگ بۆ پارتی دیموکراتیی بدات.

# کۆچی دوایی

## [ ١ ] گەشت و سەردانەکانی دوایی:

مامۆستا نوورسیی سالانی دوایی تەمەنی لە شاری «ئیسپارتە» لەگەڵ قوتابیەکانیا بە سەر ئەبرد، جار جاریش سەری لە «بارلا» دەدا، هەروەها «ئەمیرداغ». جا چونکە بە سالا چوو بوو زوربەی کات لە جێگادا دەکەوت.

خەڵکیی زۆر حەزیان لە سەردانی بوو، بەلام نەی‌دەتوانی ماوە بدات بە هەموو کەس بۆیە ئەی‌وت:

**- پێیان بڵێن: خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور سەدقات لە قسەکردن لەگەڵ منا چاک‌ترە.. با پەیامەکانی نوور بخوێننەوە.**

قوتابیەکانی ئاگاداری بارودۆخی ژیانی مامۆستا بوون، بۆیە بە بێ داواکردن سەریان لێ نەدەدا. لەگەڵ ئەمەشا پەیوەندیی بە جیهانی دەرەوە نەپچراندبوو و کاری یەکێ لە قوتابیەکانی تەرخان‌کردبوو بۆ ئاگاداربوون لە نووسراوی گرنگی رۆژنامەکان و، بایەخی بە چاپ‌کردنی پەیامەکان و ئەو دادگا زۆر و زەبەندانە دەدا کە بۆ قوتابیانی نوور ئەگیران..

ئەوە بوو لە شانزەی نیسانی سالی ١٩٥٨ دا چی قوتابیی لە دەوری مامۆستا بوون بۆ خزمەت‌کردنی و ئەوانەش خەریکی چاپ‌کردن و بلاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور بوون لە «ئانقەرە» و «ئەستەمبوول» هەموویان بەند کران.

بۆ ئەمە پارێزەر (بکر برق) چووە پێشەوە تا بەرگریان لێ بکا. سەرێکی لە بەندیخانەی «ئانقەرە» دا چاوی بە قوتابیانی نوور بکەوێ و پرسیاریان لێ بکا کە ئایا حەز ئەکەن هەوڵ بدا بە زووترین کات لە بەندیی رزگاریان بکات، یـان پێیان خۆشە بەرگریی لە بانگەوازەکەیان بـکات و روونی بکاتەوە ، بێ گوێ‌دان بە بەردانیان ؟

هەموو بە جارێ تکایان لێ کرد با هەموو هەوڵ و کۆششێکی لە پێناوی روون‌کردنەوەی بانگەوازە پیرۆزەکەیانا بێت، چونکە رازین بۆ چەند سالێکیش لە بەندیخانەدا بمێننەوە.

ئەم پارێزەرە بۆی دەرکەوت ئەم قوتابیانە مرۆڤی ئاسایی نین، ئەمانە سەروماڵیان داناوە بەختی کەن لە پێناوی بانگەوازەکەیانا ، گاڵتەیان بە بەندکردن

و مردن دێت. بۆیە بڕیاری دا هەموو توانایەکی بخاتە کار بۆ بەرگریی لەم کۆمەڵە ئیمانداره لە هەموو ئەو دادگا زۆر و زەبەندانەدا کە سەرانسەری ولاتیان گرتۆتەوە. هەروەها سەرێکیشی لە مامۆستا نوورسیی دا و ئەمیش توند گوشیی بە سنگیا و ماوەی دا وەکیلی بێت(١).

مامۆستا نوورسیی لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیا زنجیرە گەشتێکی بۆ چەند شارێک کرد، وەک بیەوێ قوتابیەکانی بە خوا بسپێرێ و ئاگادار بن دوای خۆی کاری سەرشانیان لە یاد نەچێتەوە و پەیامەکانی نوور بە هەموو لایەک بگەیەنن.

ئەوە بوو لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٩ دا سەفەری بۆ «ئانقەرە» کردو لەوێشەوە بۆ «ئەمیرداغ» و لە ١٩ی مانگیشا بۆ «قۆنیا» و دیسان بۆ «ئانقەرە» و لە ١/١/١٩٦٠دا بۆ «ئەستەمبووڵ» و دوو ڕۆژ تیایا مایەوە. جارێکی تریش گەڕایەوە بۆ «ئانقەرە». ئەوە بوو نوێنەری گۆڤاری (تایم) وت*ووێژێکی درێژی ڕۆژنامەگەریی لەگەڵا کرد و لە ١/٦/١٩٦٠ دا بلاو کرایەوە. دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ «قۆنیا» و لە هەمان ڕۆژا بەرەو «ئیسپارتە» ڕۆشت.

ئەم سەردانانەی مامۆستا لە کۆتایی تەمەنیا خڕایە قاڵبێکی پڕ مەترسییەوە و دوژمنانی ئیسلام بە شتێکی گەورەیان دایە قەڵەم و ڕۆژنامەکانیان دەستیان دایە هێرش و پڕوپاگاندە کردن و هەڵبەستنی جۆرەها درۆ و دەلەسە، وەک کارێکی پڕمەترسیی بە دەست مامۆستاوە بێت و ئەو پیاوە چاکانە ترسیان لەوە هەبێ لافاوی خوێن لە ولاتا هەڵسێ.

---

(١) پارێزەر (بەکر بەرق) لە ساڵی ١٩٢٦ز لە دایک بووە و، کۆلێژی (حقوق)ی ئەستەمبووڵی تەواو کردووە و کە لە ساڵی ١٩٥٨دا ئاشنایی لەگەڵ مامۆستا نوورسی و قوتابیانی نوردا پەیدا کرد، ئەمیش سەر و ماڵ و ژیانی خۆی خستە پێناوی خزمەتی نوور و لە سەدان دادگادا کەوتە پارێزگاری و بەرگریی لە پەیام و قوتابییانی نوور، تا ئەمساڵ لە ڕۆژی ١٥/٦/١٩٩٢دا بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد و، هەر بەو کفنەی کە زووتر لە تافی لاوی‌دا بۆ خۆیی ئامادە کردبوو و هەمیشە لەناو جانتاکەی دەستی‌دا بوو کە لە دادگاکان‌دا هەڵی دەگرت، کفن کراو، نزیکەی دە هەزار کەس لە مزگەوتی (سوڵتان محمد فاتح) لە ئەستەمبووڵ نوێژی جەنازەیان لەسەر کرد. کاتێکیش بەرەو گۆڕستانی (ئەبوو ئەییوبی ئەنصاری) بەڕێ کرا، ئاسمان نم نم فرمێسکی بارانی دەڕشت و تەسدیقی (مەفهوومی موخالیفی) ئایەتی ﴿فما بكت عليهم السماء والارض﴾ ی دەکرد!

بەڵێ، هەواڵی وەفاتی ئەم مەردە بەجەرگ و دڵسۆزەی ئیمان سەرانسەری تورکیا و گشت هۆ و دەزگایەکی بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندنی بۆ ماوەیەکی زۆریش دوای وەفاتی سەرگەرم کرد، وەفاتیشی - لە لایەکی ترەوە - ئاشتی و برایەتی و لێبوردەیی بە دڵی تێکڕای قوتابییان بەخشی. دەسا نوقمی دەریای ڕەحمەت بێ، چونکە مردنیشی - وەک ژیانی - مایەی خێر بوو بۆ ئیمانداران و سڕینەوەی هەر لەکە و گەردێ ڕووبەڕەی دلانیانی گرتبێ.

که مامۆستا له ١٩٦٠/١/١١ دا گەڕایەوە بۆ «ئەنقەرە»، دەوڵەت بە ڕادیۆی «ئەنقەرە» بانگەوازێکی لێ کرد و پێی ڕا گەیاند کە چاکتر وایە بۆی لە «ئەمیرداغ»دا نیشتەجێ ببێ، ئیتر ئەوە بوو گوێڕایەڵی کرد و گەڕایەوە بۆ «ئەمیرداغ»، بەڵام داوای کرد لە دەوڵەت ماوەی بدا مانگێ لە «ئەمیرداغ» بێ و مانگێکیش لە «ئیسپارتە».

له ١٩٦٠/١/٢ دا مامۆستا لە «ئەمیرداغ»ەوە چوو بۆ «ئیسپارتە» و دوای ئەوەی ماوەیەکی تیا مایەوە ڕووی لە «ئافیوون» ناو ڕۆژێک لەوێ مایەوە و گەڕایەوە «ئەمیرداغ». بەڵام لە مانگی مارتا زۆر زۆر نەخۆش بوو، کە ئەوە بوو تووشی نەخۆشیی ئاوسانی سی «ذات الرئة» بوو بوو.

## [ ٢ ] گەشتی ماڵئاوایی:

لەمانگی مارتا نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هێنایەوە، جارێکی تریش تەندروستیی بەرەو چاکیی ڕۆیشت هەتا نیوەی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٧٩ ک، دوای ئەوە جاریکی تر تەندروستیی تێک چۆوە و قوتابیەکانی شەو و ڕۆژ چاودێرییان دەکرد. مامۆستا دڵی هەواڵی دا بوو بەو زووانە ئەو قوتابیە دڵسۆزانە بە جێ دێڵێ .. ئەو خۆشەویستانە هەموو کەس و کارێکی بوون. ژیانی لە گەڵیانا ئەم شـــار و ئەو شـــار و ئەم بەندیخانە و ئەو بەندیخانە دەبردەسەر.

لەو ماوە ناسکەدا کە مەیدان، جگە لە مامۆستا نوورسیی، کەسی تیا نەما بوو ئاڵای «لا الـه الا الله» بەرز کاتەوە، ئەوان پشتگیری بوون و هاوبەشیی هەموو سزا و ئازارێکیان دەکرد.

لە کاتێکا کە دەوڵەت قورئانی پیرۆزی لە وڵاتا یاساخ کرد بوو، ئەوان ـ بە فەرمانی مامۆستا ـ بە دەست دەیان نووسیەوە و بڵاویان دەکردەوە.

لە کاتێکا کەس نەیدەوێرا بەرگریی لە ئیسلام بکا، ئەوان سەر و ماڵیان خستە ئەو لاوە و ژیانی تاڵ و سوێریان هەڵبژارد بەو مەرجەی لەگەڵ بانگەوازەکەی مامۆستادا هەنگاو هەڵ گرن.

لە بەر ئەوە خۆشەویستییەکی بێهاوتا لە نێوان مامۆستا و قوتابیەکانیا دروست بوو بوو.

ئەوە بوو شەوێکیان پێی ڕاگەیاندن کە سبەینێ ئەبێ بچین بۆ «ئۆرفە». خۆیان ئامادە کرد و لە کاتژمێری نۆی پێش نیوەڕۆدا کەوتنە ڕێ، لەو کاتەدا بارانێکی بە خوڕەم دای کرد..

مامۆستا و حوسنیی و بایرام و زوبەیر بەرەو ئۆرفە دەرچوون و کاربەدەستان کەوتنە هەواڵ پرسینی و ئاگادارکردنی شارەکان بێ ئەوەی هیچ هەواڵێکیان دەست کەوێ.

بۆ سبەینێ کاتژمێری یانزەی پێش نیوەڕۆ گەیشتنە «ئۆرفە» و لە میوان خانەی «ئیپەک پالاس» دابەزین..

هەواڵی گەیشتنی مامۆستا کەوتە گوێی دانیشتوانی شار و ورووژان بە سەر ئوتێلدا بۆ بینینی مامۆستا. بۆ ڕۆژی دووەم کاربەدەستان و پۆلیس فەرمانیان دا بگەڕێنەوە بۆ «ئیسپارتە».

لەو کاتەدا دکتۆر هات بۆ سەرنجدانی تەندروستیی مامۆستا، بەلام بە خێرایی میوانخانەکەی بە جێ هێشت، هەر وەک لە کاربەدەستانەوە فەرمانی پێدرابێ نارەحەتیی حاڵی مامۆستا نەخاتە بەر چاو تا لەو شارەدا نەمێنێتەوە.

دەنگوباسی دەرکردنی مامۆســـتا بـــە ناو شـــاردا بلاوبوویەوە.. ئەو مامۆستایەی ســەرانسەری ژیانی بە خزمەتی قورئان تەواو کردووە، شێرانە بەشداریی بەرگریی ولاتی کردووە دژی ڕووســە داگیرکەرەکان، بە هەموو شێوەیەک خزمەتی خۆی بە جێ هێناوە، ئا لەم پیرییەدا و بەم نەخۆشییە بۆچ لە شار دەربکرێت ؟

ناودارانی شار زۆر هەوڵیان لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشدا دا تا واز لە میوانی بەڕێز بهێنرێ، بەلام بێهوودە بوو چونکە فەرمان لە پایتەختەوە دەر چوو بوو.

نزیکەی پێنج هەزار لە دانیشتوانی شار لە بەردەم میوانخانەکەدا کۆبوونەوە و نارەزاییان دەردەبڕی لەم هەڵوێستە نالەبارەی دەوڵەت.. تا ئەوە بوو هەندێ لە قوتابیانی نوور خۆیان گەیاندە لای بەڕێوەبەری خەستەخانە تا بێن و سەرنجی تەندروستیی مامۆستا بدەن.

دکتۆر هات و کە سەرنجی دا دەبینێ پلەی گەرمای ئەگاتە چل پلە. بەمە بڕیاری لیژنەی پزیشکانی بۆ دەرچوو بە هیچ شێوەیەک نابێ بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێ تر.

بۆ ڕۆژی داهاتوو چەند پۆلیسێک هاتن و کلیلی ئوتومبێلەکەی قوتابییەکانی مامۆستایان وەرگرت و ئەوەندەی پێ نەچوو بەڕێوەبەری ئاسایشیش خۆی هات بۆ بینینی مامۆستا و ڕێگای دا بچێتە ژوورەوە لای. کە داوای لێ کرد «ئۆرفە» بە جێ بێڵێ چونکە وەزیری ناوخۆ فەرمانی داوە، مامۆستا پێی وت:

**« من له دوا خوله‌که‌کانی ته‌مه‌ندا ده‌ژیم.. من ده‌ڕۆم.. له‌وانه‌یه هه‌ر لێره‌دا بمرم.. ئه‌رکی سه‌رشانتان ئه‌وه‌یه ئاوی گه‌رم ئاماده که‌ن بۆ شۆردنم.. ئه‌مه ڕاگه‌یه‌نه به سه‌رۆکه‌کانت ».**

کام دڵه زۆر ڕه‌ق بێت ئه‌بێ ئه‌م دیمه‌نه و ئه‌م وشانه کاری لێ بکه‌ن. بۆیه به‌ڕێوه‌به‌ری ئاسایش سه‌ری داخست و به خۆی و پۆلیسه‌کانه‌وه گه‌ڕانه‌وه دوا و دیمه‌نه‌که زۆر کاری تێ کردن.

صه‌ده‌ها بروسکه‌ی ناڕه‌زایی له لایه‌ن دانیشتوان و کۆمه‌ڵه‌کانی شاری «ئۆرفه»وه نێررا بۆ «ئه‌نقه‌ره»ی پایته‌خت:

به چ مافێکه‌وه «بدیع الزمان» مامۆستا نوورسیی له شاری «ئۆرفه» ده‌رده‌که‌ن ؟

ئه‌و ڕۆژه مامۆستا هێزێکی خوایی پێ به‌خشرا به‌و هه‌موو نه‌خۆشیی و پله‌ی گه‌رمیی به‌رزه‌وه ماوه‌ی دا سه‌ده‌ها به‌ڵکو هه‌زاران له ناسراوان و خۆشه‌ویستانی سه‌ری لێ بده‌ن و یه‌ک به یه‌ک داوای دوعای خێری لێ بکه‌ن، ئه‌میش بیان نووسێنێ به سنگیه‌وه و دوعایان بۆ بکات.

بۆ ئێواره‌که‌ی پله‌ی گه‌رمای به‌رز بۆوه، «بایرام» سه‌رپه‌رشتیی ده‌کرد، چاوی لێ کلا نه‌ده‌کرد، هه‌ر ده‌م سه‌یری ده‌م و چاوی گه‌شاوه و نوورانیی مامۆستای ده‌کرد که له تاو تای به‌هێز سوور سوور بووبوویه‌وه و لێوه‌کانیشی به بێ ده‌نگ خه‌ریکی پاڕانه‌وه و موناجات ده‌بوون.

کاتی سێی دوای نیوه شه‌و «بایرام» سه‌رنجێکی مامۆستای دا وای‌زانی خه‌وی پیاوکه‌وتووه، بۆیه بێ‌ده‌نگ زۆپاکه‌ی داگیرساند و کاتی پارشێو هات و براکانی تری هه‌ڵساند.. له مزگه‌وته‌کانه‌وه ده‌نگی بانگ به‌رز بۆوه بۆ ده‌ربڕینی ته‌نیایی و گه‌وره‌یی خوای په‌روه‌رده‌گار، که‌چی مامۆستا وه‌ک جاران هه‌واڵی نوێژی نه‌پرسی.

که‌وتنه گومان بۆیه چوون به دوای شاره‌زاییه‌کا، که هات و سه‌رنجی دا به چاوی پڕ له فرمێسک و ده‌نگێکی له‌رزۆکه‌وه وتی: ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾.

مامۆستای خواناس دوای ژیانێکی پڕ له مه‌ینه‌ت و ئه‌شکه‌نجه و ئازار له پێناوی ئیمان و ئیسلامدا، ئه‌م جیهانه‌ی به‌جێ هێشت و له دوای خۆی له ماڵی دنیادا کات‌ژمێرێک و جبه‌یه‌ک و مێزه‌رێک و بیست لیره‌ی تورکیی به‌جێ هێشت. به‌ڵام «په‌یامه‌کانی نوور»ی کرده خه‌ڵاتی مرۆڤایه‌تیی به تێکڕا و موسڵمانه‌کان به تایبه‌تیی تا نه‌خشه‌ی هه‌ڵس‌وکه‌وتی ئه‌م چه‌رخه‌یان تیا ده‌رخا بۆ گرۆی ئاده‌میی و بتوانێ له‌م هه‌ڵوێسته نالەباره‌دا خوای گه‌وره له خۆی ڕازیی بکا و ئه‌رکی سه‌رشانی ڕاسته‌قینه‌ی مرۆڤی له یاد نه‌چێ.

[٣] مامۆستای نەحەساوە دوای مردنیش:

نزیکەی دوو مانگ دوای مردنی مامۆستا نوورسیی بارودۆخی ولاَت گۆڕا و بە کوودەتایەکی سەربازیی پارتی دیموکراتیی لە سەر تەخت لابرا و دەسەلاَتی تازە دژایەتیەکی تەواوی بەرامبەر بە ئیسلام و موسلْمانان، بە تایبەتیی قوتابیانی نوور، دەر خست و، مامۆستای بێ‌تاوانی ژێر گلْیش لەو هەلْمەتە درندانەیان بێ‌بەش نەبوو، زۆر داخیان لێ هات بەر لە مردنی دەسەلاَتیان وەرنەگرت تا خۆیان بێ‌دەن لەسێ‌دارە، بەلاَم هەر ئەبێ داخی دلْی خۆیانی پێ بڕێژن.. چونکە یەکەم کەسێ گەلی تورکیی بانگ کردبێتەوە بۆ سەر ئیسلام و کاریگەریی بووبێ بۆ سەر کۆمەلْ مامۆستا نوورسیی بووە. بۆیە کارێکیان کرد کە هیچ ئادەمییەک ڕای لە سەر نیە، لەگەلْ هیچ کەسێکا، چ جای بەرامبەر بە دلْسۆزێک وەک ئەو، بکرێت.

ئەوە بوو لە (١١)ی تەمووزی سالْی ١٩٦٠دا والیی «ئۆرفە» لەگەلْ سەرکردەی سەربازیی ناوچەی خۆرهەلاَتا سواری فڕۆکەیەک بوون بۆ «قۆنیا» بۆ لای مامۆستا «عەبدولمەجید»ی برای مامۆستا نوورسیی و لەوێ بە زۆر پییان مۆر کرد کە داوای کردووە لاشەی مامۆستا لە «ئۆرفە» بگوازرێتەوە !!

لە مامۆستا عەبدولمەجید وا بوو ئێستا ئێسقانی برای ئازیزی بوون بە خۆلْ، کەچی کە دەستی دا لە کەفنەکەی وا دەر دەکەوت کە دوێنێ مردووە، کەفنەکەی ڕێک و پێک بوو تەنها لای سەریەوە هەندێ زەرد بوو بوو و ئەوەندەی دلْۆپێک ئاویش دیار بوو.

کاتێ کە پزیشکەکەش کەفنەکەی لە دەم و چاوی لادا شێوە زەردەخەنەیەک لە سەر دەم و چاوی بوو، لاشەی پیرۆزیان هەلْ گرت و خستیانە تابووتێکەوە و بە فڕۆکە بردیان بۆ «ئافیوون» و لەوێشەوە بە ئوتومبێل برا بۆ «ئیسپارتە» و لە شوێنێکی نەزانراوا نێژرا.

دەولْەت هەرچی دەرهەق بە مامۆستا کرد، کە گوایا ئازاری بدا و بانگەوازەکەی دوا بخات، ئەنجامەکەی بە پێچەوانەوە دەرچوو، چونکە بەو ئازار و بەندکردن و دەربەدەرییە مامۆستا توانیی ئەرکی پیرۆزی ئەنجام بدا و بگاتە ئەو ڕادەیە کە بتوانێ پەیامەکانی نوور بنووسێ. ئەو بەوبەختانەی کە دژی مامۆستا دەوەستان بوونە هۆی ئەوەی ڕاستییە ئیمانییەکان بلاَو ببنەوە. ئەوانە ئایینیان لە ولاَتا یاساغ کرد تا گەلی تورکیی موسلْمان بە تەواوەتیی تینووی ئیمان و ئیسلام ببێت و باوەشی خۆشەویستیی بۆ بکاتەوە، وەک سالْەهای سالْ خۆشەویستێکی نەبیزراوی لێ دوور کەوتبێتەوە.

ئەم جارەش کە دەوڵەت ئازاری مامۆستای دەدا بە گواستنەوەی گۆڕەکەی، بووە هۆی بە دییهاتنی ئاواتی مامۆستا خۆی کە لە خوای پەروەردگار پاڕابوویەوە کەس شوێنی گۆڕەکەی نەزانێ جگە لە کەمێ لە قوتابییەکانی.

## [ ٤ ] پەیامەکانی نوور دوای مامۆستا:

قوتابیانی نوور ئەوپەڕی وەفادارییان نواند بەرامبەر مامۆستای ئازیز و پەیامە شیرینەکانی. بیروهەستی بەرز و پیرۆزیان بلاوکردەوە و پەیامەکانیان گەیاندە هەموو شوێنێ و، هەموو ولاتێ.. تا ئێستاش بۆ ئەم زمانانە وەرگێڕراون: کوردیی، عەرەبیی، ئینگلیزیی، ئەڵمانیی، فەڕەنسیی، ئیتاڵیی، ئوردیی، کۆجاراتی، مەلایا، فارسیی.

ئەمەش ناوی ئەو پەیامانەی کە مامۆستا (فاروق رسول یحیی) تا ئێستا کردوونی بە کوردیی و بلاوی کردوونەتەوە: پەیامی بیماران، پەیامی پیران، وتە بچووکەکان، سروشت، لە بارەی مەلائیکەت و ژیانی دوا ڕۆژەوە، پەیامی ڕەمەزان، حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان، ئیخلاس و برایەتیی، زللەی میهرەبانیی، چارەسەریی وەسوەسە، مرۆڤ و ئیمان، بەری درەختی ئیمان، موعجیزاتی ئەحمەدی.

لە چەند نامەیەکی زانکۆییش لە ولاتە عەرەبیەکاندا لە بارەی بدیع الزمان و پەیامەکانی نوورەوە چەند لێکۆڵینەوەیەک پێشکەش کراوە. وەک ئەو نامەی دکتۆرایەی کە (دکتۆر سمیر رجب) لە میسر ئامادەی کرد. هەروەها (احمد فهد الشوابکە)ش لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی (الجامعە الاسلامیە) کە بە سەرپەرشتیی (دکتۆر محمد حرب عبدالحمید) لە زانکۆی (عین شمس) ئامادەی کردووە، لە بارەی « بدیع الزمان »ەوە دواوە. جگە لەمانەش چەند نووسەرێکی ناسراو بە چەندین زمان لە بارەی « بدیع الزمان »ەوە نووسیویانە، وەک: دکتۆر عماد الدین خلیل و، دکتۆر محسن عبد الحمید و، دکتۆر علي محي الدین قەرەداغی و، دکتۆر محمد سعید رمضان بووطی و، دکتۆر محمد حرب عبدالحمید و، دکتۆر ماجیدە مەخلووف و، دکتۆر حسین مجیب و، مامۆستا احسان قاسم الصالحي و، مامۆستا ادیب ابراهیم الدباغ (لە عێراق و ولاتە عەرەبیەکان دا)، هەروەها دکتۆر حامد ئالگار (لە ئەمریکا) و، دکتۆر ئانا ماسالا (لە ئیتالیا) و، دکتۆر سەروەت سەوڵەت (لە پاکستان) و، ڕۆژنامەنووسی موسڵمانی ئەڵمانیی: محمد سالم عبد اللە و، قەشەی ئەڵمانیی: ئیلیاس کریستۆفەر (لە ئەڵمانیای خۆرئاوا) و، دکتۆر شریف ماردین و، دکتۆر

علي مەرمەر لە زانکۆی دۆرهام (لە ئینگلتەرا) و، ئەشرەف ئەدیب و، سەفا مورسەل و نجيب فاضل و نجم الدين شاهینەر (لە تورکیا).

هەتا ئێستاش بزووتنەوەی وەرگێڕان و لێ کۆڵینەوەی مێژوویی و زانستیی و ئایینیی و فەلسەفیی و کۆمەڵایەتیی بەردەوامە و نەوەستاوە و، ـ بە کومەکیی خوا ـ هەر بەردەوام دەبێت، تا رووبارێکی ئیسلامیی پیرۆز دروست بکات و لەگەڵ رووبارەکانی تری ئیسلام یەک بگرن و بەو ئاوە پاک و زوڵاڵە ناوچەکانی هەر چوار لای جیهانی ئیسلامیی ئاو بدەن و، بیابانی وشک و برنگی دەست نەمامی بیروهەستی نەزانیی و دوور لە خوایی بگۆڕێ بە باغ و بێستان و سەوزاییەکی ئەو تۆ کە شایانی رێبازی خواناسیی بێت، ئەوجا بڕژێتە دەریای بانگەوازی ئیسلامەوە، ئەو بانگەوازەی کە جێنشینی بانگی پێغەمبەران و پیغەمبەرایەتیی و ئیمان و ئیسلام و ئیحسانە.

ئەمەش لە پێناوی بەشداریی‌کردنێکی کاریگەری بەهێزی ئەمیندار بۆ بەرپاکردنی زەمینەیەکی ئیسلامیی نوێ بۆ دوا رۆژی ئەم ئایینە خواییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیشارەتی بۆ کردووە کە ئەم ئایینە سەر لە نوێ پەرە دەسێنێتەوە و سەر دەکەوێتەوە و، دەوڵەتێکی گەورە لە سەرانسەری جیهاندا، بەر لە تەقینەوەی بوونەوەر و هاتنی رۆژی دوایی کە بەڵێنی هاتنی دوای ماوەیەکی کورت دراوە، بەرپا دەکات..

[٥] خۆزگەم بە خۆت:

مامۆستای ئازیز و خۆشەویست! کۆچی دواییت کرد.. گەشتی زەمینییت تەواو کرد.. ئەو ئەرکەی خرابووە ئەستۆت بە جوانیی جێ بە جێت کرد..

هەموو کەسێ ئەم جیهانە بە جێ دێڵێ، بەڵام جیاوازیی تیایە..

هەندێ بە سەری بەرزەوە و، هەندێ بە سەری شۆڕەوە.

هەندێ بە قازانج و هەندێکیش بە زیان..

هەموو کەسێ ئەگاتە بازاڕی قیامەت، بەڵام هەندێ ڕوومەت گەشاوە و هەندێکیش ڕووڕەش.

خۆزگەم بە خۆت مامۆستا گیان.

خۆزگەم بە خۆت لە چێژی قورئان بەشی خۆتت دەست کەوت.

خۆزگەم بە خۆت توانیت بە ڕاستیی ببیتە خزمەتگوزاری قورئان و قوتابیی پێغەمبەر ﷺ.

خۆزگەم بە خۆت بە پێی پێویستیی ئەم چەرخە ناهەموارە توانییت خزمەتی موسڵمانان و گرۆی ئادەمیی بکەیت.



لە ساڵی ١٩٥٩دا مامۆستا تەشریفی هێنا بۆ ئەستەمبووڵ و هەر لە ناو ئۆتۆمبێلەکەدا ئەم وێنەیەی گیراوە.





دەیان هەزار کەس، لە هەمەو ناوچەیەکی تورکیاوە هاتن بۆ «ئۆرفە» تا بەشداریی بکەن لە بەڕێکردن و ئاشتنی تەرمەکەیدا.

بەڵکو خۆزگەم بە یەک‌بەیەکی قوتابیەکانت کە نرخیان زانییت و بە دەمتەوە هاتن و دەستی یارمەتییان لەم کارەتدا بۆ درێژکردی و، ویژدانی خۆیان سەرفراز کرد..

هەر ئیمان‌دارێ باسی بێ‌نازییت ئەبیستێ کە تا ئاخر و ئۆخری ژیانت ستەمکاران نەیان‌هێشت پشوویەک بدەیت و هیچ مافێکیان بۆ نەهێشتیتەوە ئەوپەڕی داخ و خەفەت دەچێتە دڵیەوە.

مامۆستا گیان بۆ کۆچی بێ‌نازت دڵ‌زامدارین..

بەڵام سوپاس بۆ خوا ئیمان‌داران لە سەرەمەگا مەردانە لێت کۆبوونەوە.. مەردانە دەوری تەرمەکەتیان دا و سەلماندیان قوتابیی قورئانن.

وەک خۆت دەڵێیت:

« ئێمە کوچ دەکەین و هیچ چارەیەک نیە و، ڕێگای مانەوەمان نادرێ ».

خۆت کۆچت کرد بەڵام پەیامەکانی نوور کۆچ ناکەن و هەر بەردەوامن لە ئەنجام‌دانی ئەرکی سەرشانیان، تا خوای‌گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی دەرمانی دڵەکانیان پێ بکا و ئەمجارەش کۆمەڵێکی ئیمان‌دار ســـەرزەویی ئاوەدان بکاتەوە.

[٦] لە کۆتاییدا:

سوپاسی بێ‌پایان بۆ پەروەردگار وا جارێکی تریش خەڵاتی میللەتی کوردی کردەوە.

وا جارێکی تریش رۆڵەیەکی زیرەکی ڕەوشـــتبەرزی ئـازای چاونەترسی کۆڵنەدەری لە نێو کوردانا هەڵخست، تا بە ژیرانە دەرمانی دەردەکانی موسڵمانان بکا..

جاری یەکەم ئەوروپای خوانەناس هێرشێکی خاچ‌پەرستانەی کردە سەر خاکی پیرۆزی ئیسلام و بۆ چەند ساڵێک بەشێک لە خاکی موسڵمانانی گلاو کرد، تا ئەوە بوو سۆزی بە لێشاوی پەروەردگار خرۆشا و دەستی یارمەتیی بۆ «صلاح الدین». ـ خوا لێی رازیی بێ ـ درێژ کرد تا بەر پەرچی هێرشی بێ‌ئیمانیی بداتەوە و خاکی ئیسلام پاک کاتەوە و سەری موسڵمانان لە بەردەم گەلانی جیهانا بەرز کاتەوە.

جارێکی تریش بیروهەستی بێ‌ئیمانیی ئەوروپا هێرشی هێنایەوە بۆ سەر جیهانی ئیسلامیی بـــە نیازی قووت‌دانی موســـڵمانان و لـــەنـــاو بردنی بیروباوەڕیان، بەڵام خوای گەورە لە قەد پاڵی چیا سەرکەشەکانی کوردستانا

کۆرپەیەکی تری کۆڵنەدەر و چاونەترسی پەروەردە کردەوە، تا دوای شارەزاییەکی تەواوی قورئان و سوننەت، قۆڵی مەردایەتیی لێ هەڵ ماڵێ و شێرانە ـ بە پەیامەکانی نوور ـ بیروباوەڕی کوفر و ئیلحادیی ڕاماڵ بکا و بەرەیەکی ئیمانیی لە تورکیادا و دوای ئەوەش لە سەرانسەری زەوییدا پێ بگەیەنێ، تا جارێکی تریش سەری کوردان بەرز بێتەوە و ناونیشانی ئازایەتیی و زیرەکیی میللەتی بەش‌خوراو بخرێتەوە بەرچاو و گوێی میللەتانی جیهان..

وا منیش بەش بە حاڵی خۆم پێم خۆشە ئەم چەند لاپەڕەیەی ژیانی مامۆستا نوورسیی بخەمە پێش‌چاوی خوشک و برایانی هاوزمان و ئیمان‌دارم، کە میللەتی خۆیانیان خۆش دەوێ، تا بزانن چۆن هەنگاو هەڵگرن .. هاواریان لێ دەکەم ئیتر با بەسی بێ، با لەمە زیاتر سەر لە خۆیان و لە کەسانی تریش نەشێوێنن .. ڕێبازی کەڵک بەخشی پڕ لە هێمنیی و ئاسایشی مامۆستا هەڵبژێرن و لەو ڕوانگەوە خزمەتی کوردانیش و خزمەتی موسڵمانانیش بکەن..

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

١٩٩٠/١٢/٢٣

# سەرچاوەکان

١- الاخلاص والاخوة
تأليف: بديع الزمان سعيد النورسي ، ترجمة : احسان قاسم الصالحي ، مطبعة الشعب - بغداد ١٩٨٥.
٢- بديع الزمان سعيد النورسي، نظرة عامة عن حياته وآثاره
تأليف: احسان قاسم الصالحي، مطبعة ( قشاق ) - استانبول ١٩٨٧.
٣- بديع الزمان سعيد النورسي
تأليف: الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي ، مطبعة ( دار الجزائر ) دمشق ١٩٦٤.
٤- پەیامەکانی نوور (بە کوردیی) کە مامۆستا فاروق رسول یحیی وەری‌گێڕاون.
٥- الثمرة من شجرة الايمان
تأليف: بديع الزمان سعيد النورسي، ترجمة احسان قاسم الصالحي، مطبعة الزهراء الحديثة - الموصل ١٩٨٥.
٦- الداعية الاسلامي الكبير ، سعيد النورسي . تأليف الدكتور سمير رجب محمد ، القاهرة.
٧- ذكريات عن سعيد النورسي
ترجمة: اسيد احسان قاسم، مطبعة الحوادث - بغداد ١٩٨٦.
٨- رسائل النور لاتنطفئ
تأليف: بديع الزمان سعيد النورسي، ترجمة: عاصم الحسيني، مطبعة ( دار القلم ) بيروت ١٩٨١.
٩- سعيد النورسي رجل القدر في حياة أمة
تأليف: اورخان محمد علي.
١٠- الشيوخ
تأليف: بديع الزمان سعيد النورسي ، ترجمة : احسان قاسم الصالحي ، مطبعة الزهراء الحديثة - الموصل ١٩٨٤.
١١- النورسي الرائد الاسلامي الكبير
تأليف: الدكتور محسن عبد الحميد، مطبعة الزهراء الحديثة - الموصل ١٩٨٧.

# ناوەرۆک

( بە کۆمەکیی خوا تەواو بوو )

## ئەم نووسراوە

کورتە ژیانی پاڵەوانێکی نوێ خوازی ئیسلامە لەم سەردەمەدا کە سەراپای تەمەنی لە خواپەرستیی و خزمەتی ئیسلامدا بە سەر بردووە، تا دڵەکەی زاخاو بدا و لە ئەنجاما بگاتە بیر و نەخشەیەکی ناوازە بۆ خزمەت کردن و تێ گەیاندنی موسڵمانانی چەرخی نوێ، بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی رەببانیی لە ئایینی خوا بگەن و بتوانن بە ڕاستییش خزمەتی بکەن و بە بانگی دڵسۆزیی و خۆشەویستیی، بە کۆمەکیی خوا، مرۆڤایەتیی سەرفرازی هەردوو جیهان بێت..